

# ڕۆڤار

ژمارە ٧٩

ڕۆڤار، بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیرییە
هەر ژمارەی
تایبەتە بەداهێنەرێکی کورد
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
دوو مانگ جارێک دەریدەکات



سەرپەرشتیار
ڕەووف بێگەرد

بەڕێوەبەری نووسین
کامەران سوبحان

دەرهێنەری هونەری
ئومێد محەمەد

دیزاینی بەرگ
ئارام عەلی

تایپیست
ئارام مەحموود

ناونیشان
سلێمانی- شارێی سالم
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

www.serdem.net

پەیوەندیکردن بەڕۆڤارەوە لەڕێگەی
ئیمێلی
Rovar.sardam@gmail.com
Rovar.facebook.com

چاپخانەی
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

نرخ: 1000دینار

تابلۆی بەرگ
ناکام محەمەد ڕەسوڵ

## ژمارەکانی ڕابردووی ڕۆڤار

ئیبراهیم ئەحمەد، محەمەد مەولود (مەم)، کەمال مەزهەر، لەتیف حامید، سوارەی ئیلخانی زادە، محێدین زەنگەنە، ئەحمەد هەردی، یەڵماز گۆنای، ئیسماعیل بێشکچی، موحەرەم موحەممەد ئەمین، دڵدار، مەستورەی ئەردەڵانی، مەولانا خالیدی نەقشبەندی، جەمال عیرفان، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، جەلالی میرزا کەریم، ڕەفیق چالاك، عەبدولخالق مەعروف، هێمن، حسێن حوزنی موکریانی، ئەمین فەیزی، کامەران موکری، جەلال تەقی، حەمە سالَح دیلان، هەژار، شاکیر فەتاح، کاکەی فەلاح، عەلائەدین سەجادی، شێخ محەممەدی خاڵ، حسێن عارف، عەلی ئەشرەفی دەروێشیان، سەلیم بەرەکات، پێشەوا قازی محەممەد، مەحموود مەلا عیزەت، فایەق بێکەس، عەبدوڵڵا پەشێو، جگەرخوێن، بابەتاهیری عوریان، عەرەب شەمۆ، دڵشاد مەریوانی، مەنسوری یاقوتی، حەسەنی قزڵجی، برایم ئەمین باڵدار، مەسعود محەممەد، بەختیار زێوەر، نەجمەدینی مەلا، مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی، لەتیف هەڵمەت، حاجی قادری کۆیی، پیرەمێردی نەمر، مەلا مەحموودی بایەزیدی، شێخ ڕەزای تاڵەبانی، شەریف پاشای خەندان، جەمیل صائیب، ئەحمەد موختار جاف، عەبدولڕەحیم ڕەحیمی هەکاری، میر شەرەف خانی بەدلیسی، وەفایی، گۆران، بەدیع باباجان، جەمال شاربازێڕی، مارف بەرزنجی، نالی، مەحوی، ئەنوەر قەرەداخی، حەمەی مەلا کەریم، سەید عەلی ئەسغەری کوردستانی، ئیبراهیم یونسی، قەرەنی جەمیل، مەلای گەورەی کۆیە، تۆفیق وەهبی بەگ، محەممەدئەمین زەکی، عەبدوڵڵا جەوهەر، مستەفا بەگی کوردی، شێرکۆ بێکەس، سالم، عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ.

# پێڕست

# سەرووتار



## ئەحمەد کایا لوتکەی هونەر و هەڵوێست

*ئەم ژمارەیەی ڕۆڤار، بۆ یەکێك لە هونەرمەندە مەزنەکانی کورد دەردەکەین، کە ئەویش (ئەحمەد کایا)یە، ئەم هونەرمەندە بە تەمەنێکی کەم بەخششێکی زۆری بە هونەر و نەتەکەوەی بەخشی، بە جۆرێك تەنانەت دوای خۆی ئەلبوومی گۆرانییەکانی ژمارەیەکی یەکجار زۆری لێدەفرۆشرێت و تا ئێستاش لە ناو کورد بەگشتی و کوردانی باکوور بە تایبەتی، وەك فریادڕەس و شێخێکی مەزنی هونەری گۆرانی و مۆزیکی نەتەوەیی تەماشا دەکرێت.

*دەمێکە بیرۆکەی دەرکردنی ڕۆڤارێکی لەم شێوەیەمان هەبووە، پێمان وابوو (ئەحمەد کایا) پێویستی بە ڕۆڤارێك هەیە لانیکەم بۆ ئەوەی خوێنەری کورد لە کوردستانی باشوور ئەم هونەرمەندە بناسێت، چونکە بە داخەوە لەگەڵ ئەوەی ئەم هونەرمەندە ناوبانگێکی جیهانی هەیە، بەڵام تا هەنووکە لە کوردستانی باشوور، وەك پێویست نەناسراوە. بەو هیوایەی ئەم ژمارەیەی ڕۆڤار، دەروازەیەك بێت بۆ ناسینی ئەم هونەرمەندە بە خوێنەرانمان لە هەرێمی کوردستان.

*ئەم ژمارەیەی ڕۆڤار وەك زۆرێك لە ژمارەکانی تر، تایبەتمەندی خۆی هەیە. یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی لە بابەتەکانیدایە، بەو پێیەی لە کوردستانی باکوور دەرفەتی زمانی دایك بۆ نووسین نەبووە، ئەمەش بووەتە کۆسپ لە بەردەم گەشەسەندنی ئەدەب و هونەری کوردی لەو پارچەیەی کوردستان، بۆیە بە ناچاری ڕۆڤار ڕووی لە هەندێ وەرگێڕی تورکی نا، بۆ ئەوەی کێومالێکی ئەو بابەتانە بکەن کە بە زمانی تورکی لەسەر ئەحمەد کایا نووسراون، گرنگترینیان وەربگێڕنە سەر زمانی کوردی، ئەمە جگە لەوەی هەندێ نووسەری(کایا) ناس لەم ژمارەیە بەتایبەتی بابەتیان لەسەر ئەو هونەرمەندە بۆ ڕۆڤار نووسیووە، ئەمە جگە لەوەی هاوکارمان مەسعود زیلان بیبلۆگرافیای کار و ژیانی هونەریی و ویستگە گرنگەکانی (ئەحمەد کایا)ی بە کوردی لاتینی بۆ ئامادەکردووین و لەم ژمارەدا بڵاومان کردووەتەوە.

*لەبەر تایبەتمەندی وێنە و ستایلی کارکردن و لە پێناو پاراستنی جوانکاری و نەخشەسازی ئەم ژمارەیە، بڕیارماندا ئەم ژمارەیەی ڕۆڤار ئەم ژمارەیە بە نەخشەسازییەکی تایبەت و بەڕەنگاوڕەنگ دەربکەین، بۆ ئەوەی گیانی بەرزە فڕی ئەو هونەرمەندە مەزنە هەر بەنەمری بمێنێتەوە.

*پێشتر و لە سەرەتای ئەم خولەی ڕۆڤاردا ناوی چەند کەسایەتییەکمان دەستنیشان کرد بۆ ئەوەی ڕۆڤاریان بۆ دەربکەین، بە خۆشحاڵییەوە هەموو ئەو ناوانە ڕۆڤارمان بۆ دەرکردن و بەردەوامیش دەبین لەبەسەرکردنەوەی ناوە درەوشاوەکانی نێوەندی ڕووناکبیریی و هونەریی نەتەوەکەمان، بە خوێنەرانی ڕۆڤار ڕادەگەیەنین ژمارەی داهاتوومان، لە خولی نوێی کارکردنی ڕۆڤاردا، ژمارەیەك بۆ نووسەر و ئەدیب و زماناسی کورد (شوکر مستەفا) دەردەکەین. وەك هەموو ژمارەکانی ترمان، چاوەڕێی بابەت و نووسینەکانتانین.

**بەڕێوەبەری نووسین**

ئەحمەد کایای گۆرانیبێژ و ئاوازدانەر و مۆسیقار، لەساڵی ١٩٥٧ لە شاری مەلاتیەی باکووری کوردستان لە دایک بووە. دواتر بنەماڵەکەیان بە ئومێدی ژیانێکی باشتر ڕوودەکاتە ئەستانبۆڵ. ئەحمەد، لە ئەستانبۆڵ تێکەڵی سیاسەت دەبێ. لە گەڵ سیاسەتیش خۆی فێری مۆسیقا دەکا و شیعر دەنووسێ و لە پێناوی بژێوی ژیانیشیدا هەموو جۆرە کارێک دەکات، دەبێتە شۆفێری لۆری و فرۆشیاری گەڕۆک و کرێکار. لە ساڵی ١٩٨٥ بڕیاردەدا یەکەمین ئەلبومی گۆرانییەکانی بڵاوبکاتەوە، بەڵام لە بەر ئەوەی شێوازەکەی، شێوازێکی نوێیە ناوەڕۆکی شیعرەکانی شۆڕشگێڕانەن، هیچ دەزگایەکی هونەریی ئامادە نابێ هاوکاری بکات. هەڵوێستی دەزگاکان ساردی ناکەنەوە، بەهاوکاریی دۆستەکانی یەکەمین ئەلبوومی خۆی بەناوی (مەگری بچکۆل) بڵاودەکاتەوە و ڕەواجێکی باشی لە لای خەڵکی دەبێ، بەڵام حکومەت قەدەغەی دەکات.

گۆرانیبیژی هەژاران، ئەحمەد کایا کە بەگۆرانییە کۆمەڵایەتییەکانی دەبێتە گۆرانیبێژی خەڵکی هەژار و کوردی ستەمدیدەی تورکیا، گۆرانییەکانی بە چەکێک دەزانێ لە دژی بێ دادی و دوژمنانی بوونی کورد و بەوهۆیەوە گەلێ جار دەگیرێ و گۆرانییەکانی قەدەغە دەکرێن و ڕێگای گۆرانی گوتنیشی لێ تەنگ دەکرێتەوە. لە ئاداری ١٩٩٩، کاتێ خەڵاتی باشترین گۆرانی ساڵ لە بەرنامەیەکی تەلەفزیۆنی وەردەگرێ، ڕایدەگەیەنێ: (من گۆرانییەکی کوردیم لە ناو ئەلبومە تازەکەم داناوە، چونکە من بەڕەسەن کوردم! گومانم نییە گەلێ کۆمپانیای مۆسیقا حەز دەکەن ئەلبومە تازەکەم بڵاوبکەنەوە! تورکیا گرفتێکی هەیە بە ناوی (کوردستان)، لەبەرئەوە من هەرگیز لە باسکردنی ئەم گرفتە بۆ ئەوانەی دان بەراستیدا نانێن، ماندوو نابم). دوای تەواو بوونی ئەم قسانە، چەند هونەرمەندێکی شۆڤێنست هێرشیان کردە سەری و هاواریان کرد: (خاین! بڕۆ دەرێ) بەڵام ئەحمەد سوورتر بوو. (دادگای ئاسایشی نیشتمانی تورکیا) لە ٣٠ ی نیسان تۆمەتی خیانەت لە نیشتمانی دایە پاڵی و لە هەموو لایەکی تورکیاوە تورکە توندڕەوەکان هێرشیان کردە سەری و هەندێ ڕۆژنامە و دەزگای ڕاگەیاندن داوای حوکمی ئیعدامیشیان بۆ کرد، بەڵام ئەحمەد کایا، بێباک لە بەردەم یەکەمین دانیشتنی دادگا ئامادەبوو، هەموو ئەو تۆمەتانەی ڕەتکردەوە کە درابوونە پاڵی. لەو ماوەیەدا، ئەحمەد کایا چووە ئەورووپا. دادگای ئاسایشی نیشتمانی تورکیا لە دوا دانیشتنیدا، بە بێ ئامادەبوونی، سزای ١٠ دە ساڵ زیندانی لەسەر ئەحمەد کایا سەپاند. لە ١٦ی تشرینی دووەمی ٢٠٠٠، کاتێ بۆ سازکردنی کۆنسێرت لە پاریس بوو، لە شوێنی حەوانەوەی خۆی، کۆچی دوایی کرد و لە گۆڕستانی ناودارانی پاریس (پیرلاشیز) بە خاک سپێردرا، دوای خۆی، گوڵتەنی هاوسەری ئەلبوومە تەواو نەکراوەکەی (گوێ بگرە وڵاتە خۆشەویستەکەم)ی بڵاوکردەوە. ئەمەی خوارەوە، بەشێکە لەو داکۆکینامەیەی ئەحمەد کایا لە بەردەم دادگای ئاسایشی نیشتمانی تورکیا پێشکەشی کرد:

(من لەسەر چەقۆ ڕاوەستاوم! کەسێک کە لە پێناوی گەلەکەیدا دەجەنگێ. ئەم داکۆکینامەیەتان لە بیربێ... لە ساڵی ١٩٨٥ مۆسیقارێکی پیشەیی بووم. ژنم هێناوە و دوو کیژی حەڤدەو دوازدە ساڵەم هەیە. سەدان سترانم داناوە و گەلێ ئاوازیشم بۆ کەسانی دیکە داناوە. حەڤدە ئەلبومم بڵاوکردۆتەوە، کە چەندان ملیۆن دانەیان لێ فرۆشراوە. لە وڵاتانی دنیا کۆنسێرتم کردووە و چەند جارێک وەک گۆرانیبێژی ساڵ لە لایەن دەزگا هونەرییە جۆرا وجۆرەکانەوە هەڵبژێردراوم. تەمەنم چل و دوو ساڵە و لە تورکیا دادەنیشم. بەتورکی بیرم کردۆتەوە و بەتورکی نووسیومە و بەتورکیش گۆرانیم گوتووە. من مۆسیقارم و هاووڵاتییەکی ئەم دنیایەم کە خۆی بەموڵکی هیچ ناوچەیەک نازانێ و هەست و سۆزی رووی لەمرۆڤە. دڵم ئەوەندە گەورەیە جێگای چاکەی گشت زمان و کولتوورو باوەڕو گۆرانییەکانی دنیای تێدا دەبێتەوە. تۆمەتێکم پێوە لکێنراوە کە ژیانی هەڵگێڕاوەمەتەوە. تۆمەتی خیانەت!. پێیان گوتووم کە من کەسێکی دووبەرەکی خواز،



کایا لەسەردەمی لاویدا

ئەڵقە لە گوێ و بێ ئەدەب و بێ ئەقڵ و شێتم. ئەم سیفەتانە تۆمەتی کەس و گرووپگەلێکی ناسراون. روانگە و قسەی مرۆڤێک- کە بنەمای هەموو ئەم تۆمەتانەیە- لە هیچ وڵاتێکی پێشکەوتوو و یاسا پەروەردا بەتاوان و تۆمەت ناژمێردرێن.

## ئـــــەحمەد کــــایا...کوردبوون

من لە ئەلبوومە تازەکەمدا گۆرانییەکی کوردیم گوتووە، چونکە من کوردم. کلیپیشم بۆ کردووە. باوەڕم وایە کەسانێک هەن پێیان خۆشە لە تەلەفزیۆنەکانیاندا بڵاوی بکەنەوە. ئەگەر وانەکەن، دەبێ گومان لە کورد بوون و مرۆڤ بوونیان بکرێ. ئایا ئەو کەسانەی کە بەخاین و دووبەرەکی خواز و دوژمن زانینی من، هەستی نیگەتیڤی هەوادارانم دەورووژێنن و دەبنە هۆی جودایی چینایەتی و نەژادی، کەمینە نین؟ ئەو چەند ملیۆن کەسەی گوێ لە قسەکانی من دەگرن، خەڵک نین؟ من لەو هۆڵە، بەبیستنی (خاین، بڕۆ دەرێ!)، تووڕە بووم، چونکە ئەم قسەیەم لە دەمی کەسانێک بیست، هەر کاتێ وشەی (کورد) یان گوێ لێ دەبێ، جوێن دەدەن. لێرەوە پێیان دەڵێم، وازناهێنم تا واقیعیەتی بوونی کوردان قبوڵ دەکەن. بە بڕوای من، رێک هەر ئەم کەسانە بوون کە وشەی (برایەتی) یان پێشێل کرد و بوونە هۆی دروست بوونی درز لە ناو کولتووری هاوبەشی وڵاتەکەمان. گەورەترین چەکی گۆرانیبێژێک گۆرانییەکانیەتی و من رێگا نادەم گۆرانییەکانم خراپ لێک بدرێنەوە و مانایەکی دیکەیان بۆ داتاشن. بۆ نموونە، ئەگەر من بمگوتبا گۆرانییەک بەزمانی ئیتاڵی ، یان عەرەبی و ئینگلیزی دەڵێم، ئایا



کایاو دایکی

هەرا و هۆریایەکی لەم جۆرە دروست دەبوو؟ ئەم تۆمەت و سزا خواستنە، بەڕای من هەوڵی هەندێ کەناڵی تەلەفزیۆنییە بۆ پەیداکردنی شتێک لە ناو قسەکانم، تا زنجیرەی تەلەفزیۆنی لێ دروست بکەن. ئەگەر من لە هەموو کۆنسێرتەکانمدا کە هەزاران کەس ئامادەی دەبن. شتێکم گوتبا و بووبا بە هۆی دووبەرەکی نێوان خەڵکی، ئەودەم دەمتوانی ئەم تۆمەتانەت قبوڵ بکەم، بەڵام هیچ نییە... کاتێ وێنەی ڤیدیۆیی ئەو شەوە لە لایەن زەینێکی ڕۆشن و بە ویژدانەوە شی بکرێتەوە، ئەوجا دەزانین پیلانێک لە دژی من بەڕێوەیە. هونەرمەندان لە هەر جێگایەکی دنیابن، یەک زمان و یەک شێوازی تایبەت بەخۆیان هەیە کە بە هۆیەوە خۆیان دەردەبڕن. من لە بەر ئەوەی حەزی هەوادارەکانم لە کۆنسێرتەکانم بە نیشانەی سەرکەوتنی خۆم زانیوە. بە نیشانەی سەرکەوتن بەخێرهاتنم کردوون. ئەمە بۆتە ئارمی من و لە تەواوی دیدارە تەلەفزیۆنییەکانیشمدا بینیوتانە. ئەم ئارمە، بەخێرهاتنێکی هەمیشەییە و لە هەموو دنیادا لە لایەن سیاسەتمەدار و هونەرمەند و ئەستێرەکانی وەرزشەوە بەکار دەهێنرێ. ئەم نیشانەی (٧) یە، سەرەتای وشەی Victoria بە مانای سەرکەوتنە و نابێ بە دوای مانایەکی تردا بگەڕێن.

دەربڕینێکی ئاشکرا خەڵکی ئێمە دەبێ تێبگەن کە چەند لەدنیای ئەمڕۆ دوورن، تا نیگەرانی دابەشبوونی وڵات نەبن، بە هۆی گۆرانییەکی کوردی. ئەو شتەی ئەوانی تر لە ژێر لێودا دەیڵێن، من بە هاوار دەریدەبڕم. ئێمە لەم وڵاتەدا دەژین و ئەگەر لە ڕاستییەکان بگەین، ژیان و وڵاتێکی باشتر و پێشکەوتووترمان دەبێ. وادیارە دەبێ من ئیدی لە گوڕینی گۆرانییەکانم بە پارێزتربم و لە ڕاستیدا ئیتر مۆڵەتی ئەو گۆڕینە بچووکانەشم نابێ، بەڵام ئێوە پێتان وایە لە هەلومەرجێکی وادا من هەست بە ئازادیی بکەم؟ ئەم دادگایە، بە دروستبوونی بەڵگە و مەنتیق و حوکمی دادپەروەرانەی لە بەرچاو نەگرتووە و هەموو یاسا و ڕێساکانی دنیای پێشێل کردووە. من ئیدی ئەم وڵاتە بەجێ دەهێڵم کە من بە (دووبەرەکی خواز و خاین) ناو ببەن.

ئەلبوومی گۆرانییەکانی ئەحمەد کایا: (یاخی دەبم، ناو: خۆشبەخت، گرفتاری دەردەسەرم، سترانی بەیان، دیواری ئەشق، سەردەمێک دێ، گۆرانییەکانم بۆ چیاکان، دەستم لێ مەدە دەسووتێی، مەگری بچکۆل).

## دادگایی کردن و دەرکران لە تورکیا

دادگای ئاسایشی نیشتمانی تورکیا لە ٣٠ ی نیسان تۆمەتی خیانەت بە نیشتمانی دایە پاڵی و لە هەموو لایەکی تورکیاوە تورکە توندڕەوەکان هێرشیان کردە سەری و هەندێ ڕۆژنامە و دەزگای ڕاگەیاندن داوای حوکمی

ئیعدامیشیان بۆ کرد. لەوانە ڕۆژنامەی حورییەت بوو کە یەکەم بابەتی دوو ڕۆژ دوای پەلامارەکەی کاتی وەرگرتنی خەڵاتەکە یەکەم بابەتی دژی کایا بڵاوکردوە بە وێنەیەکی دروستکراو گوایە کایا لە بەرلین کۆنسێرتی کردوە و پارەی بۆ (پەکەکە) کۆکردۆتەوە کە هەڵبەستراو بوو [٣]. دواتریش چەن بابەتی دیکەی بە دوادا هات [٤]. بەڵام ئەحمەد کایا، لە بەردەم یەکەمین دانیشتنی دادگا ئامادە بوو، هەموو ئەو تۆمەتانەی ڕەت کردەوە کە درابوونە پاڵی. لەو ماوەیەدا، ئەحمەد کایا چووە ئەورووپا. دادگای ئاسایشی نیشتمانی تورکیا لە دوا دانیشتنیدا، بەبێ ئامادەبوونی کایا، سزای ١٠ دە ساڵ زیندانی بۆ ئەو دا.

## خەڵاتی سەرۆکایەتی تورکیا

عەبدوڵا گویلی سەرۆکی تورکیا، خەڵاتی «گەورە»ی بەخشییە کایا پاش مەرگی لە ڕۆژی لە دایکبوونیدا کە ٢٨ی تشرینی یەکەمی ٢٠١٣دا. [١] یەکێ لەو هۆیانەی ئەکرێ ئەم سەرۆکەی تورکیا ئەو کارەی کردبێ ئەوەیە کە سەرۆک وەزیران ڕەجەب تەیب ئەردۆگان کاتێ دژی ئەتاتورک شیعرێکی خوێندەوە، لە ساڵەکانی ١٩٩٠دا و لە سەری زیندانی کرا، ئەوکات کایا پشتیوانی خۆی بۆ دەربڕیبوو [٤]




وێنەی گۆڕەکەی کایا

# چەند هەڵبەستێکی گۆرانییەکانی:

## یاخی دەبم

وەرامیان بۆ دەگێڕمەوە
ئەو دایکانەی دەستیان خستۆتە سەر دڵیان
باسی زیندانەکان دەکەم، لە ژان دەدوێم
ئاژاوەیەك بەرپا دەکەم
چونکە لەوانە دەترسم کە سەریان خستۆتە ژێرخاك!
یاخی دەبم
کۆڵانەکانی پڕماتیك رووت دەکەمەوە
پێناوە پیسەکانیش
ناوەکان گۆناکەم
من شەپۆلی دەریای گەلم
ئەو گوللەیەی پشتی لە خەڵکە
یاخی دەبم... هێی
دێم باوەڕ بکەن... دێم...
هاوارەکانم بەردەوامن...
لەو چاوانە دەدوێم کە خۆیان بە دەمامك شاردۆتەوە
لە قەدەغەکان و
حوکمی دادگا...
ناترسم
چونکە بەگازی شەمشەمەکوێرەیەك شێت بوومە
یاخی دەبم
سوێند بێ بەخوێن
تەسلیم نەبم...
گوڵێکم لە دارستانی گەل
ئێی... حیلەبازی بێ شەرەف
من ئەو خەنجەرەم شەڕ رادەگەیەنێ
گوللەیەکی تەقێنراوم
یاخی دەبم! ئایی
دێم... باوەڕم پێبکەن
خەڵکینە... دێم!

## فریام کەوە

نەشاخ دەڕمێ، نە ئەم دیوارە
ئاە هەڵدەکێشم! گریانم دێ!
وەرە لە کوێی؟ پونگەکان وشک هەڵاتوون بەهاریش ژاکاوە
چۆك دادەدەم! گریانم دێ!
فریام کەوە، وەرە لە کوێی؟
گوڵم لە کوێی؟
گیانم لە کوێی؟
چاوەڕوانم دەکەی بمرم.
ئەو دەمی دێی؟
دەست بە سەر بالیفی چۆڵدا دێنم...
ئاە هەڵدەکێشم، دەگریم،
بگە فریام!
سووتام، تەنیا خەڵووزم لێماوە
چۆك دادەدەم! دەگریم، وەرە لە کوێی؟
گوڵم لە کوێی؟
گیانم لە کوێی؟
چاوەڕوانم دەکەی بمرم
ئەو دەمی دێی؟
دەڵێن گەورە دەبی، کچگەل!
تۆ نازانی زیندان چییە
لە مانای زەردیی پاییزیش ناگەی
گریانی من نابینی،
لە کونجی زیندانی سارد و تاریك...
دەڵێن گەورە دەبی، گچکەل
ئەشق هی منە و حەسرەت هی تۆیە
ئێواران بە دوای تاریکیدا دەگەڕێن
شەوەکان، دەبنە ڕۆژ،
یەك بە یەك!
شەوانە بە دوامدا مەگەڕێ
لە تاریکی پڕ لە دەرد مەڕوانە



من لە ناو هەتاودا دەگەڕێم
بە ڕۆژی ڕۆشن، بە دوامدا بگەڕێ
ڕۆژێك دێ، دێمەوە...
بە باری خۆشویستن، ڕامووسان
ئێواران بە دوای تاریکی دەکەون
شەوەکان، دەبنە ڕۆژ، یەك بە یەك

## تۆو

ڕۆژان تێپەڕین، ساڵان ڕابوردن
تۆم نەبینی، کیژە جوانەکە!
بەداخەوە بووم بۆ وێنەکەی تۆ
ماوە لە دڵدا داخی دووریی تۆ!
پرسیم لە مانگی ڕووخۆش، هەواڵت!
یەکسەر تووڕە بوو، ڕووی لێ وەرگێڕام
بەڵام ئەو دەمەی ئەستێرەم دواند،
یەکسەر پێکەنی و پێمدا هەڵشاخا...
شەوان کە ئاسمان هێلانەی مانگە
تۆوی ژێر زەوی زۆر زۆر دڵخۆشن،
ئەگەر ئەم جارە نەگەڕێیتەوە،



سینەم پڕ دەبێ لە دەرد و ئازار...!
خەنجەری ئەشقم لە سینگی خۆدا
زامە کۆنەکان، گریان تێبەردام
ئەگەر کازیوە، نەگەڕێیتەوە
بزانە دەمرم، ئیتر من فەوتام!

## ئیدی بەسە

شتێك بڵێ کە نەزانم
بۆ نموونە (خۆشبەختی)م پێ بناسێنە
تاحەز بکەی درۆم بیستن،
شتێك بڵێ کە نەیزانم
سترانێکی نوێ بێژە،
باسی لێکدابڕان نەکا
واز لەگۆرانییە کۆنەکان بێنە
لەو بەهارە مەدوێ
کە لە مێژە نەهاتووە!
شتێکم پێ بڵێ، نەزانم!
زۆر بێزارم لەو هەموو چیرۆکە کۆنە
فێرە پێکەنینم بکە
شیعرێك بخوێنەوە کە شوێن پێی خەم،
لە چاوەکانمدا جێ نەهێڵێ.
شتێك بڵێ کە نەزانم!.



## مەرگیش دەلەرزێ[٧]

لەو چۆڵە، لە داریان بەستەوە
بەشێوەیەك چاوی لێکنا
دەتگوت دەچێتە خەوێکی پڕ لە خەون.
باسرمەیەك هەڵی کرد و
هەتا مەرگیشی دەلەرزاند
ئەمە خوێنەکەی خۆیەتی
کە بە دەنگە سپییەکەی-

داستانان دەبێژیّ!
چۆکیان دادا
تەقەیان لە تفەنگان هەستاند
دڵی بووە لانەی ڕەوە داڵی قوڕقوشم
باسرمەیەك هەڵی کرد و
هەتا مەرگیشی دەلەرزاند!
ئەو شەوە کۆترێك
لە لەپی دەستیدا، هەڵکوڕما
لەکەی خوێنیش کەلەپچەکەی ڕازاندەوە
ئەمە خوێنی ئەوە،
کە بە دەنگە سپیەکەی
داستانان دەبێژیّ!.



# ئەسپێکی یاخیم ناوم کەحلانە

سیا نەریمان



لەم نووسینەدا دەمەوێت بە خوێنەران بڵێم، ئەحمەد کایا مێژووی لەو ڕۆژەوە نییە کە وتی من کوردم، بەڵکو زۆر پێش ئەو ڕوداوانەیە. دەمەوێت وێستگەکانی ژیان و بەرهەمەکانی وردتر بکەمەوە.

## ئەحمەد کایا وەکو شاعیر، هونەرمەند، شۆڕشگێڕ.

ناوەڕاستی هەشتاکانە، لە قاوەخانەیەکدا کایا نامیلکەیەکی شیعری (حەسەن حوسێن کۆرکمازگیل)بە دیاری وەردەگرێت. لە شاعیرێکی لاوی کوردی زازای ناوچەی دەرسیمەوە (یوسوف خەیاڵۆغڵوو). لەو دەمەدا تورکیا لە نێوخۆدا، بە کڵپەی کودەتا و شەپۆلە تورکە کەمالچییەکان دەکوڵێت. ئەم شاعیرە گەنجەش، هەمان کات میوزیکژەنە.

خەیاڵۆغڵوو برای خاتوو (گویلتەن کایا) یە کە لە ساڵی ١٩٨٦ دا لەگەڵ کایا خێزان پێکدەهێنێت. ناسینی گویلتەن لەڕێگای سەزەر ناوێکەوەیە کە برای سەلدا باغجانی گۆرانی بێژە و خاوەنی ستودیۆی «دەیشیم»ە کە کایا کاری لەگەڵ کردوون، ئەودەم هەردوکیان لە زیندان بەیەکتر ئاشنا بوون. لە دوای خێزان دروستکردن لەگەڵ گویلتەن، ئیتر کایا و خەیاڵۆغڵوو ئاوێزانی شیعرو مۆسیقا ئەبن (1،2،3).

سەرەتای ناسینیان کاتێک بوو، کایا لە تەنگەژەی ڕەتکردنەوەی بڵاوبونەوەی یەکەم ئەلبومی دەژیا (مەگری کوڕپەکەم- کە لەگەڵ هەمان ستودیۆ بڵاوی کردەوە. زۆر ئاستەم بوو، گۆرانییەکانی بەو دەقە بەرەنگاریانەوە پەخش بکرێن. ئەلبوومەکەی ٣ گۆرانی شیعری خۆی بوون، ئەوانەی تری هی ئەو شاعیرانە بوون کە مێژووی ژیانیان بە بەرهەڵستیکردنی حوکمی عەسکەر و نەتەوەپەرستەکان بردبووەسەر. لەوانە ناویان وەکو خاینی نیشتیمان و بێشەرەفە کۆمەنیستەکان بڵاوبوبویەوە. ئەوانەش:

سەباحەتین عەلی (بە شیعری «ڕۆژگار لێرە ناڕوات»)

ئەحمەد عارف (بە شیعری ‹لە حەسرەتی تۆدا کەلەپچەکانم داڕزاند›)

نازم حیکمەت (بە شیعری «هەمان لق و پۆپ»)



بەڵام کایا ئەم ڕیتمەی هەر بەرنەدا و بەردەوام شاعیرێکی تری دەخستە پاڵ کارەکانی، کە هەمان دەردەسەری و خەونی ئەوی هەبوو. هەردووک دەرکراوی ناوچەیەکی کوردستان و نێو گوند و چیاکان بوون بۆ شارێکی تابازی وەکو ئەستەمبوڵ. هەر بۆیەشە بۆ هەموو ئەوانەی لە زێدی خۆیان دەرپەڕێنراون و ئەستەمبوڵ هاڕیونی هەڵوێستەی کردووە، بە شیعری خەیاڵۆغڵوو گۆرانی (پێم نەگوتی حەیدەر) کە لە سەرەتاکەیدا دەڵێ:

**لەو کێوانە کەو بوین**
**لێ ئێستاکێ لەم زبڵەدا قەلەڕەشین**
**ئەم شارە بۆ ئێمە زۆر گەورە بوو،**
**هاڕینی، کردمانی بە گاڵتەجاڕ**
**پێم نەگوتی حەیدەر، ئیستەنبوڵ هەڵمان دەواسێ!**

کایا نەیدەویست خۆی بکات بە موڵکی لایەنێک، خۆی لە حیزب و ڕێکخراوەکان بە گەورەتر دەزانی، دیارە گەورەتر لە پەیامدا. دەگەڕا لە هەر کوێیەکی ئەو نیشتمانە کەسێک بچەوسێتەوە ئەم کۆنسێرتی دەگێڕا و هەمیشە لە کۆنسێرتەکانی پەیامی خۆی لەسەر ڕووداوەکانی ڕۆژگار دەدا. هەربۆیەشە توشی لێپێچینەوە و چاودێری و زیندان و دادگا دەبووەوە (١).

کایا لە کۆنسێرتەکانیدا بە پێچەوانەی هونەرمەندەکانی ترەوە، کۆنسێرتی لە باخچە و شوێنە گشتییەکاندا دەکرد، زۆر بە هاوکاری گرووپی گەنجانی شۆڕشگێڕی و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی و خوێندکارانی زانکۆ. بۆیە تا دەهات خۆشەویستی لە هەموو توێژەکانی کۆمەڵگە زۆرتر دەبوو. ئەوەندە حەقبێژ و مکوڕ بوو لەسەر هەڵوێستەکانی، دیوارێکی پتەوی ڕێزی بۆ بەرامبەرە پێچەوانەکەی دادەنا، کە ئێستاش زۆربەی تورکە نەژاد پەرستەکان سەرەڕای بیری پێچەوانەیان ڕێزی لێ دەگرن و دەڵێن: کایا شارقجی (گۆرانیبێژ) نەبوو، بەڵکو سەناتجی (هونەرمەند) بوو.

کایا دەچووە هەموو ماڵێکەوە و بە بەرزترین و پاراوترین زمانی ئەدەبی. کایا لە وشەسازی و هەڵبژاردندی شیعریشدا داهێنەر بوو. بۆ نموونە وشەگەلی:

**یاقاموز**
**لیلیشان**
**ماهور**

کایا بێجگە لەوەی گۆرانی ئەلبومەکانی لە بڵاوترینەکان و زۆرجار یەکەمەکان بوون (دوای مردنیشی ئێستاش لە لوتکەی فرۆشتندان). زۆر ئاواز و گۆرانی لە لایەن گۆرانیبێژانی ترەوە وتراوەتەوە، لەوانە:
ئیبراهیم تاتلیسەز، موسلیم گویرسەس، کڤیرجلیک عەلی، زۆری تر.

## نەجدەت ئەدالی و نامەکەی بۆ دایکی

(نەجدەت ئەدالی ١٩٥٨- ١٩٨٠) خوێندکارێکی چەپی چالاکی بزوتنەوەی شۆڕشگێڕی لاوان بوو. پێش لە سێدارەدانی نامەیەکی چوارپەڕەیی بۆ دایکی دەنێرێت. ئەو کات شاعیری ئازادیخواز و ڕۆماننووس لە تاراوگە «نەوزاد چەلیک» کردویەتی بە هۆنراوە و ئەحمەد کایا کردی بە گۆرانی «ئاوازی شەبەق» کە لە کۆنسێرتێکدا و دواتر لە ئەلبوومێکدا بڵاوی کردەوە. کە بووە هۆی دەردەسەری و ئەشکەنجەدانی (4). یەکێک لەو تۆمەتانەی ئاراستەی دەکرا ئەوە بوو، کە ئەم هۆنراوەی کەسێکی یاساغی لە حکومەت هەڵبژاردووە و بۆ کەسێکی لە سێدارەدراو بە تۆمەتی (هەوڵدان بۆ لەتلەتکردنی تورکیا). واتا دوو تاوانی گەورە!
ئەم گۆرانییە بووە بە مۆرکێک بۆ بەرەنگاربوونەوە. زیندانێک نییە، ئاهەنگێکی ئازادیخوازانێک نییە تیایدا نەخوێندرێتەوە. هەروەها لە ڕۆژی دایکیشدا. هەمان شت ئەردۆغان لە پەرلەمان وتویەتیەوە و دەستی کردووە بە (گریان) بۆی (10،11).

## ئاوازی شەبەق

**چیدی لێرە بە دوومدا مەگەڕێ**
**مەگـــــەڕێ دایـــــە...**
**چیتر لە دەرگاکە پرسیاری ناوەکەم مەکە..**
**ئەستێران بەسەر پرچتدا باریون..**
**هەڵیان مەکێشە**
**مەگـــری دایـــــە...**
**زۆر کەڕەت خۆم حازر کردووە (بۆ سێدارە)**
**ڕیشم تاشیوە ئامادە...**
**هەمیشە چاوم بڕیوەتە شەبەق..**
**دەستەکانم بەرز بۆ نزا، گوێشم بۆ چرپەیەك هەڵخستووە.**
**بیری مردن ئەکەم..**
**بۆ ژیانی زیاتریش شێت بووم!**
**مردن چی شتێکی غەریبە دایـــــە!**





## لیبراڵیەتی کایا

دژە ئەتاتورک بوو وەک هونەرمەند، بە توندی دژی ئایدۆلۆژیای دەوڵەت بوو.
هیچ کات دوو دڵ نەبوو لە گۆڕینی دەوڵەت لەژێر کۆنترۆڵی سوپای تورکیا، کە

کاردەکەن بۆ لەناوبردنی کورد. کایا پارێزەرێکی سەرسەختی گروپە دینیەکان، عەلەوی، وە ناموسوڵمانەکانیش بوو کە ئەچەوسێنرانەوە لەلایەن ڕژێمی ئەتاتورکیەوە (6). هەمان کات لە هەموو گۆرانییەکانی پڕبوون لە وشەی تەواو چەپ. لە گۆرانی (مرۆڤێکی سەیر)ـدا دەڵێت:

**مرۆڤێکی سەیرە.. لە گیرفانێکیدا ‹دەس کاپیتاڵ›**

**ڕادیۆی زاگرب..**

*دەس کاپیتاڵ (Das Kapital، کتێبی «سەرمایە: ڕەخنە لە ئابوری سیاسی»): ناونیشانی بەناوبانگترین کتێبی کارڵ مارکسە.

خەڵک ئەویان بەوە بیردێتەوە کە کاتێک ڕەجەب تەیب ئەردۆگان، سەرۆک وەزیرانی ئێستا، زیندانی کرا لەسەر خوێندنەوەی هەڵبەستێکی دژی کەمالیزم لە نەوەدەکاندا. لە کۆنسێرتێکدا لە ١٩٩٨/١٠/٢٩دا لە گۆرەپانی تەقسیم (ئیستەنبوڵ) دژی هەڵسوکەوتەکەی دەوڵەت بوو (7).

هەمان شت دژی بە زۆرەملێکردنی بەناو مەدەنیکردنی دەوڵەت بوو. لە دوای کودەتای هەڵوەشاندنەوەی حکومەتەکەی نەجمەدین ئەربەکان لە لایەن عەسکەرەوە ١٩٩٧. هەوڵێکی زۆریان دا وەکو درێژە پێدان بە ڕقیان بەرامبەر پارتە ئیسلامییەکەی ئەربەکان، سەرپۆش قەدەغە بکەن. کایا لەمەشدا کەوتە دژایەتیکردنیان و لە کۆنسێرتێکدا لە شاری ئەزمیر، لە هەمان ساڵ وتی:

**«هێز نییە بتوانێت سەرپۆش لەسەری دایکم لابەرێت.»**

## کایا و دژایەتیکردنی ڕاستەوخۆی دەوڵەت و دەستور

دوای کۆمەڵکوژی کوردی عەلەوی دەرسیم ١٩٣٧ لە لایەن سوپای تورک و بە سەرکردایەتی کەمال ئەتاتورک. ناوی ئەو پارێزگایەش گۆڕدرا بۆ تونجەلی. هەمان کات کوشتنی ژن و پیاو و پەرتەوازەکردنی مناڵەکانیان بەسەر شارەکانی تری تورکیادا (کە لە شێوەی هەمان پرۆسەی ئەنفالی باشوری کوردستان بوو). دەوڵەت زۆر جەختی دەکردەوە، کە نابێت ناوی دەرسیم ئەو ڕووداوانە باس بکرێنەوە. کایا بە پێچەوانەوە ستران و بەستەی: دەرسیمی یاخی، کچانی دەرسیم، پیر سوڵتان ئەبداڵ، سەید ڕزا، (کوردێکی عەلەوی پێشەوای ئەو یاخیبونەی دژی دەوڵەت بوو) دەوتەوە. دەیوست بە وتنەوەی بەردەوام خەجاڵەتیان بکات بەرامبەر بەو تاوانانەی دەوڵەت. لە گۆرانی لە بەردەم دۆست و دوژمندا دەڵێ بۆ کچانی براکوژراو و نادیار کە شیعری ڕۆژنامەنوس و شاعیری کوردی عەلەوی (ئۆرهان کۆتان)ە:

**لە زینداندا بمهاڕن و بمگوشن..**
**دادگاییم کەن، لە «ماماك»دا توندم کەن..**
**بە خوێن (دیاربەکر)م مۆر کردووە..**
**با بمپێچنەوە لاشە لاشە، کفنم کەن..**

**ئەم ئاوازە!**
**سۆزی ئەو کێوە ئەرخەوانیانەیە..**
**مشتێ ئاوە بۆ زیندانییە هەڵاتووەکان..**
**تیکەیەکە لە گۆرانی بۆ مەحکومکراوان..**
**دەستماڵێکە بۆ سنگە کوتراوەکان..**
**شیرە بۆ مەمك..**
**گیانی بەرەکەتی بەهارە بۆ زەوی..**



نـــــه بۆ چوار دیواری تەنگ دەشێ..
نـــــه لە گلۆڵەی دڕکەزیدا بەند دەکرێ..
ئەم ئاوازە!
گوللەیەکی پڕ غیرەتە، لە لولەی تفەنگێکدایە بۆ دەرپەڕین..
لە پێشیەوە قات و قڕی و زریان و زستان..
لە پاشیەوە خۆڵەمێش و سوتك، ئەرخەوان و گێلاس..
تەڵێکیان ئاشوری دەژەنێ، ئەوی دی کلدانی!
هەموو وەرزێك زیندوو دەبێتەوە...
پەترۆلی شین و سوراییی خوێن
لە لێویکی وشکدا
دیجلە و فورات دەژەنێ...
هێی برا
ڕەنگدانەوەی ژیانە لە دەنوکی هەڵۆدا
عەشقی منە لەگەڵ پرچ ڕەشێکدا
لەشی دەڵێی پەڕەی گوڵە
ئەم ئاوازە!
سۆزی ئەو کێوە ئەرخەوانیانەیە..

کاتێك تیشکی خۆر ڕوومەتی بەفر دەڕوشێنێ
دڵی ئاسمانی دەخروشێنێ
تا جامانە و کراسەکەی خەڵتانن لە خوێن
عەشقی مەرگەسات
چاوانیش دەبنە پشکۆ، دەبنە خەنجەر
لێواولێو دەبن لە شەهامەت
دەبنە گوڵە مینا
دەستەکان ئازا و پڕ لە هونەر
لە پشتی کێوە ئەرخەوانییەکانەوە
سێ دنیای گەورە، سێ ئەفسانە
سێ هاوکێشە
سێ کۆد، سێ بۆمبی ئەتۆمی
لەگەڵ چەرخێك، وە پریشك و دینامیت هەن.
کاتێك تیشکی خۆر ڕوومەتی بەفر دەڕوشێنێ
ئاوازی کێوە ئەرخەوانییەکانیش دەگات
کە لە سنگی خۆردا کڵپە بوون





گوڵی زەمین دەژێننەوە
کە لە گولەی ناموس و شەرەفدا پێچرابوون
دڵی شۆڕش بوون
حەقیقەتێکی سپی بوون لە خەوێکی ڕەشدا
نازەنینم، ئەمە عەشقی هەزاران ساڵە

ڕامەوەستە هەی خوشکی نازدارم..
گۆرانی خۆت بچڕە بەردەوام..
بێ گریان..
بێ ڕۆڕۆ ...
بێ ڕەشپۆشین..
بیڵێ لە شەوی خەنەبەنداندا
لە لۆرکێدا، لە گۆڤەندا ..
لە تەمیرئاغا*...

* ماماک: گەورەترین زیندانی تورکیایە لە ئەنقەرە.
* تەمیرئاغا: جۆرە هەڵپەڕکێیەکی کوردی عەلەوییە.

## کایا و دەنیز گەزمیش و ئاتیلا ئیلهان

دەنیز گەزمیش ( ١٩٤٧ بۆ ١٩٧٢) چەپێکی (کەمالیست) بوو، ئەندامی چالاکی بزاڤی ٦٨ بوو، پاشان دامەزرێنەری سوپای میللی ئازادی تورکیا بوو. ئەم لاوە و هاوەڵانی بۆ دەوڵەتێکی مۆدێرن و سیکولار دەجەنگان. دەگەڕانەوە بۆ سەرەتای ڕێکەوتنی کورد و کەمال ئەتاتورک لە بەرەنگاری ئیستیعمار لە وڵاتدا. بەو پێیە داوای مافی یەکسانی ژیان و مافیان بۆ کورد و هەموو نەتەوەکان دەویست. دژ بە هەموو حوکمی سەرباز و دەوڵەت کە پێیان وابوو، هەموو کەس تورکە، ئەمان دەجەنگان و دەیان خۆپیشاندانیان ئەنجام دەدا. دەنیز لە تەمەنی ٢٥ساڵیدا لەگەڵ ٢ هاوڕێی تری بە ناوی (حوسێن ئینان، یوسوف ئەسڵان) لە ٦ مایسی ١٩٧٢ لە سێدارە دران. گەزمیش ئێستا دەوڵەتی تورک، بە قارەمان و ئەفسانەی دەزانێ، لە سەردەمانێکی زۆریش دوای لە سێدارەدانی ناوهێنانی بە ڕێکەوتیش (تاوان) و ناحەز بوو. لەو سەردەمە و بۆ ئەو هۆقە ڕووداوانە شاعیری ناوداری تورک (ئاتیلا ئیلهان ١٩٢٥ ـ ٢٠٠٥) شیعرێکی زۆر ئاست بەرزی نووسی بە ناوی (ماهورـ کە دەکاتە قەتار* بەستە و مەقامێکی کۆنی خەماوییە). ئەم دەقە کایا هات کردی بە یەکێک لە هەرە گۆرانییە بەناوبانگەکانی، کە خودی ئاتیلا ئیلهان خۆی لە ترسی لێپیچینەوەی دەوڵەت دەیوت بەبێ پرس براوە. کە دەڵێ:

نەونەمامێکی پشکوتووی دارستانێکی سوتاو بوون
لەسەر خۆ تیشکیان هەڵ دەکۆڵی، پیاوانێکی بەهێز بوون
ئەو قەتارێکی دەچڕی، من و موژگانی دەخستە گریان

(کایا لە کۆنسێرتەکاندا سێ پەنجەی بەرز دەکردەوە، وەکو نیشانەیەك بۆ ئەو سێ شەهیدە)

## ڕوونکردنەوە لەسەر چەپی کەمالیست

ڕەنگە وەکو چۆن لە کوردستان زۆر خەڵک بە وێنەی ستالین و لینینەوە کوردایەتی و خەباتی مرۆڤایەتی خۆیان دەکرد، تەنانەت لە بەردەمی پەتی سێدارەش دروشمیان بۆ دەوتنەوە. هەمان کات ئەو ڕژێمە دۆستێکی هەمان تاخمە بوو، کە ئەمانی لە سێدارە دەدا. بە لەت لەت بوونی سۆڤیەت، دەرکەوت کە ئەوانە لە دڕەندەترین دیکتاتۆرەکان بوون. لێرەش دەنیز گەزمیش و زۆر چەپی تر هەن، باوەڕیان بەوە هەبوو کە کەمال ئەتاتورک نیشتیمانی لە ژێر چنگی داگیرکەر دەرهێناوە و عوسمانیەت و حوکمی دەوڵەتی دینی پێکهێناوە. لای ئەمان سمبولێکی شۆڕش بوو. ئەمانە باوەڕیان وابوو، لەسەردەمی ئەتاتورکدا وشەی گەلانی تورکیا و کوردستان و کورد هیچ ئاریشەیەک نەبووە (لە دانیشتنی پەرلەمانی تورکیادا پارساڵ بەڕێز کاپڵان، ڕەشنوسی دەقەکانی پەرلەمانی تورکی نیشان دان (4)، کە وشەی کوردستان و کورد زۆر ئاسایی وتراوە و نوسراوە لە پەرلەماندا). بۆیە ئەمانە پێیان وابوو، کە ڕێچکەی خەباتی دەوڵەتی مەدەنی مۆدێرنی کەمال ئەتاتورک تێک دراوە و بووە بە دەوڵەتی سۆڤیەت. تەنانەت ئەوترێت کە دوا قسەی دەنیز گەزمیش پێش لە سێدارەدانی ئەمە بوو:

«بژی تورکیای تەواو سەربەخۆ. بژی بیری بەرزی مارکسی لینینی. بژی خەباتی سەربەخۆیی گەلی تورک و کورد. نەفرەت لە ئیمپریالیزم. بژی چەوساوە و لادێیەکان (ئەمەش یەکێک بوو لە گوناحە هەرە گەورەکان، ناوهێنانی تورک و کورد لە تورکیادا بە جودا). (15)

## کایا و بزوتنەوەی ڕزگاری باکور و کچی کورد و چوونە شاخ!

دەیویست هەمیشە خانمان وێنایەکی تری قارەمانی و ئازایەتیان پێ بدرێت، لەوەی تەنها سیمبۆلی عیشق و جوانی پرکردنەوەی حەزەکانی پیاوبن. بۆیە لە گۆرانییەکانی ناوی «ژنانی چیا»، «نازلێجانی یاخی» «خوشکی نازەنینم»ـی وەکو هەوێنی هۆنراوەی شۆڕشگێری و مقاوەمەت بەکاردەبرد.

لێرەدا ئەبێ بوترێ کایا نە ئەترسا لەوەی ڕاستەوخۆ باسی پیاوان و ژنانی شاخ بکات. هەتا لە بەرنامەی ڕاستەوخۆدا لێی ئەپرسن ئایا بەڕاستی تۆ خەفەت بۆ «تیرۆریست»ەکان ئەخۆیت (مەبەست پەکەکەیە)؟ ڕاستەوخۆ وەڵامی هەوادارانی ئەدایەوە و ئەیوت «واز لە فیکری خەڵک بهێنە، ئێمە خەفەت بۆ هەموو کەسێک ئەخۆین کە بمرێت» وە هەمیشە ئەیگوت کە ئامۆژگاری ئەکرێ ئەو قسانە نەکات بەڵام هەر ئەیکرد (تەماشای ٥ بکە، خولەکی ٣٤).

ئەم ئەدەبیاتەی کایا گەشتە گوێی چینی نەتەوەپەرستی توندڕەوی تورک، لێرەدا ئەم نووسەرەی ڕۆژنامەی میللیەت باسی کۆنسێرتەکەی ئیزمیر ئەکات. خۆی بەبیری خۆی دێنێتەوە کە ئەو سەردەمە کاتێ کایا باسی شاخی ئەکرد، لای ئەوان شاخ دوژمنی کۆماری تورکیا بوو، بەڵام ئەو وەک هەموو کەسێکی تر ئەپرسێ «نەک کەسێکی سەر بە مەهەپە (حیزبی نەتەوەپەرستی تورکیا) کەس هەیە گوێی لە کایا نەگرتبێت و هەستی نەکردبێت گۆرانیەکانی باسی بەشێک لە ژیانی ئەو ئەکات؟» (13)

لە هەرە گۆرانییە بەناوبانگەکانی کە شیعری (یوسف خەیاڵۆغلوو)ـە باس لە ڕووداوی یاخیبونی سێ کەس دەکات بە خۆیەوە. بەدرخان و نازلێجان و خۆی.

ئەو گۆرانیەش بە گیانی مەزڵوم دۆغان و هەڤاڵانی پێشکەشکراوە دە پارچەی یەکەمی بەم شێوەیە:

**ئێمە تەنها سێ کەس بووین**
**بەدرخان، نازلێجان و من**
**سێ دەم، سێ دڵ، سێ فیشەکی مکوڕ.**
**ناومان وەکو سێ سەرشێتی یاخی لەسەر بەردی چیاکان هەڵکەنرابوو.**
**قەدەرێکی شووم ملی ڕێگای گۆڕین، جووتێك تفەنگی بە سنگدا هەڵواسین..**



**پەنجە لەسەر پەلەپیتکە، گوێقوڵاغ بۆ زریکەی کتووپڕ.**
**پشتیشمان بە خاکەوە قایم**
**پەنجە تەزیوەکانمان بە سنۆبەر (مازووت) گەرم دەکردەوە.**
**یەکترمان بە پێخەفی ئاسمان پڕ لە ئەستێرە دادەپۆشی..**
**دەریامان زۆر لێوە دوور بوو.**
**تەنهایش پەرێشانی کردبووین**
**شەوانیش عەودالتر**
**واقەواقی چەقەڵیش لە دوورەوە**
**بۆ گۆشتی دەمووچاومان، نانەکانمان...**
**هەموو ئاوازی گۆرانیەکانی دەشێلاین...**
**ئای نازڵیجان، ئای**
**نازڵیجان مان سنگی بە مێخەك دادەپۆشی**
**بۆنی خۆش لە خۆشترین دەهات**
**ڕاهاتبووین بە دزیەوە تەماشای شەنگییەکەی بکەین**
**ئۆف دڵی چۆن شکاندین، چی حەسرەتێك بوو نەمانی.**
**وابزانم «نازڵیجان»مان لە بلوێری شوانێکدا ون کرد**
**یان بوو بە خاڵخاڵۆکە و نەخشەکانی سەر پشتی ئەوی گرت.**
**یاخود وەکو پەپوولەیەك لە نێوانمانا گیانی سپارد**
**وەکو چۆن فیشەکێك گوزەر دەکا، وەکو بڵێسەیەك تێپەڕی**
**ئای مامزە کێوییەکە، ئاخ نازڵیجان**

دوای ئەمەش بە سەدەها دەقی هەیە، کە هەمووی ئاماژەی ڕوونە بە شاخ و ڕاپەڕین و زمانی ڕەسەن و نیشتمان. ئەو هەمیشە خۆی گرێ دەدایەوە بە چیاکانەوە. وە دەیویست دڵی ئەو هەموو دایکە بداتەوە کە بەبێ کەرەستە و لە شەڕێکی نابەرابەردا دەبنە قوربانی. ئەگەر گریان و فرمێسک نیشانەی کۆست کەوتن و خەم بێ، بەڵام بەو فرمێسکانە شاخەکان سەوز دەپۆشنەوە، ئەو دووند و دۆڵانە پڕ دەکەن لە گوڵ و گوڵزار. پێدەشت تەڕ دەکاتەوە! تەڕایی ئەو فرمێسکانە تا زیاتر بن «تا بگرین، تاکو زیاتر بگرین» پاشان دەڵێ:

ئەو شەوەزەنگەی باڵی بەسەردا کێشاوین، ڕۆژێک دێ جڵەوی دەگرین! خۆرەتاو (ئاسۆ) هەر بە چنگ دەگرین! ئاواتمان لە مشت دەنێین! پێمان دەڵێ دەیبینی، دەیبینی ئەو ڕۆژە دێ دەیبینی! بەو فرمێسکانەت ڕووحی سروشت دەکەین بە بەری ئەو کێو و دۆڵانە! دەیبینی.

کایا دەیوست ئەو گیانی گیان فیدایی و چوونە سەر کێوانە بکاتە داستانێک و بیگەیەنێتە مێشکی هەموو ئەوانەی، کە دەوڵەت بە درێژایی تەمەنی پەروەردەی ڕقیان لە گەلان و کەمە نەتەوایەتییەکان فێر دەکات. لە گۆرانی لێ لێ قوربان:

**لێ لێ قوربان،**
**ئەو کێوانە نهێنی نا درکێنن..**
**لە سەر سەریان هەڵۆ زاخ دەدەن...**
**گەورەیان دەکەن،**
**نایبەخشن بە کەس.....**

کایا لە ناوەڕۆکی بیری دەوڵەت و مۆدێرنیزەکردنی ئەتاتورکی دەدا، بەوەی ئەوان بە ئێستاشەوە ڕەگەزی مێ بەکەمتر دەزانن لەوەی بتوانێت خزمەتی سنورەکانی تورکیا بکات. ئەم دیدە کۆنەپرستانە و جیاکردنەوەی مێیە، کایا بە توندی دژی دەوەستا و لە گۆرانییەکان ژنی وەکو قارەمان و کەسی یەکەمی چیرۆکەکانی نیشان دەدا. دیارە ئەم وتنەوەی کایا لە پاڵ کۆمەڵێک نووسەر/شاعیردا ڕەنگدانەوەی خۆی هەبوو. ئێستا لە باکوردا زۆر خانمی چالاک لە پەرلەمان و ڕێکخراوەکان ژنانن. بێجگە لەوەی لە خەباتی چەکداریش چی نەخشێکیان هەیە.

بۆ ئەم دیاربەکر چەقی ململانێ و ناوەڕۆکی جەنگ بوو دژی داگیرکاری و خۆسەپاندن. بۆیە دوو شاکاری مەزنی بۆ منداڵانی خۆپیشاندەری ئەو شارە نوسیووە لەگەڵ ئەفسانەی (بەختیار) کە ئاماژەیە بە کوڕێکی دیاربەکری لە زیندان. گۆرانی بەختیاری بە دەیان گۆرانیبێژ وتویانەتەوە، کە دەڵێ:

**بە بەردەمدا بردیان بە دەنگی شووت و ئینزارەرە.**
**ئۆف.. دەستی بەرز، چەپکێ گوڵیش بە دەستیەوە..**
**لێوانی مارانگازی عەشقێکی پێوە دیارە..**
**سنگی دەرپەڕاندووە دەڵێی شێری نێو ئەفسانەکانە...**

**یان لە پیاسەی قاوشەکاندا توشی دەبووم..**
**یا بەدەم جگەرەکێشانەوە، یان لە بەوبەختیمدا**
**لە ژێر کوتەك و شەلاقی جەلادەکاندا..**
**ئەو کەسی نەئەدواند، وەکو چڵەبی دەلەرزی..**
**کاتێ ئەو گوڵانەی ئاو دەدا، کە وەکو جگەرگۆشەکانی خۆشیدەویستن...**

**خەڵکی دیاربەکر بوو، ناوی بەختیارە..**
**هەموو گوناحی ئەوەیە، سازێکی بە جۆشی ژەنیووە.**
**بە بەردەمدا بردیان (بەختیاری) ڕوو وەك گوڵ**
**کوێرایم دایە بۆ سازە بەجێماوەکەی...**
**(جەرگم دەسوتێنێ سازە بێخاوەنەکەی لەوناوە)**



یان لە سترانی دیاربەکردا، کە ئەمیش هۆنراوەی خەیاڵۆغلووە دەڵێ:

**لە نێوەندی دیاربەکردا بە فیشەکێك دەپێکرێم**
**لە هەر کوێیەك بێت، دەنگی ئەم فیشەکە دەناسمەوە**
**کە لاوێتیم بەو کێوانەوە، کڵپە کڵپە دەسوتێ**
**شەوقی مانگی دەدا لە فرمێسکەکانی ڕوومەتم**
**کە شەوانە ئێشکگری دەکەم، دەمێنمەوە**

## کایا و یڵماز گوینەی

کایا خۆی و یوسوفی بە تەواوکەری پەیامی هونەری شۆڕشگێڕی یڵماز گوینەی دەزانی. بۆیە هەمیشە لە چاوپێکەوتن و بابەتەکانی سەری زۆر جەختی لە پاکی و بەرزی ئەو دەکردەوە. میدیای تورکی ئەو کات شەڕێکی نەگریسیان کردبوو، تاکو وێنەی یڵماز وەکو یاخییەکی تیرۆریست و نمەک حەرام بە نیشتمانی دایک نیشان بدەن. بەڵام ئەحمەد کایا هات و بە شیعرێکی ناوازەی خەیاڵۆغڵو بە ناونیشانی (ناوی یڵمازە و بە خۆشی کۆڵنەدەرە). لێرەدا ناوی یڵماز بە تورکی دەکاتە ئەوەی کە هەرگیز کۆڵ نادات.

**هەر بە منداڵی جەربەزە و چوست بوو..**
**هەرچەندە لە چاوما هێشتێ گچکۆلە بوو...**
**یەکجار توڕەیان کرد، ئیتر ملی چیای گرت..**
**ئێستاش نازانم، دابەزیووە یان نا؟**

**ڕەنگە بوو بێت بە تۆزی چیاکان..**
**یاخود بە ئاوازی یاخیبوونیان...**



ئەحمەد کایا لەگەڵ ژنەکەی و کچەکەیدا



**ئای چەند دڕکێکی بە ئازار بوو لە دڵما..**
**ئێستاش نازانم، چاك بووەتەوە یان نا؟**

ناوی یڵماز (کۆڵنەدەر) بوو، بە خۆشی هەر کۆڵنەدەر..
مەقامێکی بەرزی بوو، لە هیچ کوێدا نە دەگیرا (ئەوەندە یاخی و شۆڕەسوار بوو)
**جا خۆ سۆراغی لەو چیایانەش ناکرێ..**
**ئێستاش نازانم، گەڕاوەتەوە یان نا؟**

**چاوانی دەتوت مرواری چاوەزارن...**
**لە گلێنەکانی بچوکتر مەرگی دەبینی...**
**بە سواری ئەسپە شێتی (ئیزرائیل)ەوە...**
**جــــا نازانم گلانی یان نـــــا؟**

**لە سوچێکدا گرمۆڵە بوو بوو دەگریا**
**کلۆ کلۆ بەفر دەباری بە سەریا**
**لە چاوەڕوانی دەستێکی یەزدانیدا...**
**جا نازانم ئەو دەستەی گەیشتێ یان نا؟**

هەموو گۆرانییەکی کایا پڕن لە شیفرە و کۆدی نهێنی و پەیامی جۆراوجۆر. ئەو نەیدەویست وەکو قولینگێک لە جوانی گۆمێکدا ببێتە قوربانی یەک گوللەی ڕاوکەر، نەیدەویست ببێتە ڕەوە مامزی ڕێی کانی و ژیانی سوڕێکی کەم و بۆش خول بخوات. دەیویست خۆی وتەنی لە گۆرانی (قارەمانیی هەتاهەتاییە):

**من دەڕۆم، هەرگیز ناگەڕێمەوە**
**لێ نەبەزینی من ئەبەدییە**
**مەیدانیش هەر دەمێنێ**
**پێ بە کەرامەتمدا مەنێ**
**هەی نامەرد، خۆ مەیدان ماوە..**





## کایا و ئەشق و ئەوین

زۆر دەقی نایابی بۆ ئەشق و ئەوین وتووە، زۆربەیان وێردی سەر زمانی هەموو گەلانی نێو تورکیان. وە زۆر هونەرمەند وتونیەتەوە. دەقەکانی پڕن لە پاکی و خەمی مرۆڤایەتی ئەم پیاوە. لە هەموو دەقەکاندا هەوڵیداوە جێپەنجە و کاریگەری بیری خۆی بەسەر دەقەکانەوە دەربخات. بەوەی پەیامی تریان تێ بئاخنێ. بە نمونە لە گۆرانی (وەکو لم):

**ئەو دەمەی نەورەسەکان لە قولەدا دەگریان**
**من و تۆش هەر پێدەکەنین بەردەوام**
**شارەکانیان هەموو شەوێ دەکرد بۆمباران**

**من و تۆش یەکتریمان خۆشدەویست بە بێ وەستان**
**ئێستەش ئەوەندە توڕە مەبە و بڕۆی**
**بە جێم بهێڵی وەکو دوێنێ و بڕۆی**
**لێم گەڕێ لە قاچەکانت بئاڵێم**
**وەکو لم پێم پیامەنێ و بڕۆی**

## شەوی خەڵاتەکە

کایا نەیوت من کوردم، لەمەودوا بزانن ئیتر ئەوە عەرز و ئەوە گەز. بەڵکو ئەو شەوە وەکو هەموو کاتێکی تر وتی ئیتر کاتی ئەوەیە گۆرانیەکیش بە کوردی بڵێم. قسە زۆرە لەسەر ئەوەی بۆچی وای وت، دیارە خۆی لە هەموو کەس باشتر ئەزانێت. بەڵام ئەوەش ئەبێ بزانرێت کەوا هەموو ئەوانەی ئەو کارەیان کرد دواتر بە جۆرەها شێواز داوای لێبوردنیان کرد تەنها ڕۆژنامەنووسەکان نەبێت کە ئەردۆغانیش دواتر هەمان ڕاستی دووپات کردەوە. بەداخەوە چەندین ساڵ دوای مەرگی. بۆیە کایا ڕەمزی ئاشتی و برایەتی هەموو نەتەوەیەک بوو، وە خۆی ڕێڕەوی ژیری وایە کە دوای ئەو هەموو ناوبانگە ئیتر کاتی ئەوە بوو ئاوڕێکیش لە موزیکی کوردی بداتەوە. (بروانە 6، 7، 8 و 9)

ئەوەی گرنگە لە کۆتاییدا بوترێت ئەمەیە: وەک نووسەری بابەت لێرەدا (٦) ئاماژەی پێ دەکات کوشتنی کایا لە ڕێگای گۆرانیبێژە ڕەگەزپەرستەکانی ئەو شەوەی ئەستەمبوڵ نەبوو، بەڵکو ڕۆژنامەنووسە ڕەگەز پەرستە تورکەکانی وەک سەرنووسەری ڕۆژنامەی حوریەت بوو، وایان کرد ئەو دەربچێت لە تورکیا. لە پاریس لە تاو خەم و ئازار ژیانی لەوێ کۆتایی پێ بێت. هەمان کات لێکۆڵینەوەیەکی دروست و پزیشکی نەکراوە تاکو ئەم دەمە، کە ئایا مردنی کایا خوایی بووە یان لە ڕیگەی ژەهرەوە. تورکیا مێژویەکی ئاڵۆز و ناشرینی هەیە لەم بوارەدا. کوشتنی تۆرکەت ئۆزال کە بە نزیکەیی یەکلا بۆتەوە کە بەژەهری دەستی ڕێکخراوی دەوڵەت ئەرگەنەکۆن کوژراوە. هەمان کات تەماشای ژیانی خەیاڵۆغلووش بکەین زۆرتر شکمان بۆ دروست دەبێت کە دەستێکی تاوان ئەنجامی دابێت!
ڕۆژگاری داهاتوو، پەردە لەسەریان هەڵدەماڵێ!

هیوام وایە توانیبێتم ڕۆشنایەکی تر بخەمە سەر هەندێ ژیانی کایا و هاوەڵی شاعیری گەورە یوسف خەیاڵۆغڵو. کە دوانەیەکی ئەفسانەیی جیهانی مقاوەمەت و شۆڕشگێڕی ئەدەب و هونەرن. با بگەڕێمەوە بۆ ناونیشانی ئەم نووسینە (ئەسپێکی یاخیم ناوم کەحلانە):

**کوڕی هۆزم، ناوم کەحلانە***
**لە پێدەشتی قیامەتی قزڵجەدا** لە دایك بووم..**
**لەو دوند و دۆڵانەدا...**
**هەڵۆم فڕاندووە،**
**پێلەقەم لە گورگ داوە،**
**لە مرۆڤم هەڵداوە،**
**وتوومە نامەوێ بێ کەرامەت، ڕەزیل و ڕسوا!**
**وەکو مێش و مەگەزی سەرم بلەوەڕێم..**
**کۆرپەم.. کۆرپەم...**

**چاوم لە نێو چاوی بەرامبەرەکەم بڕیوە..**
**ئاوها تیژ و مۆن ڕوانیومە..**
**من بشمرم، بە خواستی خۆم دەبێ بمرم..**

**ئەسپێکی یاخیم، ناوم کەحلانە..**
**دایکم ڕەشەبایە، باوکیشم غوربەت.**
**هەزار ساڵە لەم دەڤەرەدام..**
**هەرگیز برسێتی ئەژنۆی نەلەرزاندووم...**
**تۆم خۆشدەویست...**
**قاسپەی کەوێك هەموو ئازارەکانی لەبیرم بردۆتەوە...**
**شکۆم لەسەر سنگم داوە، وەك چۆن کێو گوڵی لەسەر ڕواوە..**
**بە دانەکانم لەسەر ئاسن نەخشم کێشاوە!**

*کەحلان: جۆرە ئەسپێکی ڕەسەنی عەرەبییە، هەروەها ناوی ئەو ئەسپەی شێخی چەلەبی بووە، کە دژی حوکمی پاشای عوسمانی ڕاپەڕینی کردووە.
قزڵجە: ناوی گوند و شوێنە لە باکوری کوردستان، بە زۆری مەبەستی دەبێ (شاری قزڵجە بێ، کە نزیکە لە جێگای شێخی چەلەبییەوە).

شیعری ئەی هاوار، کە شاعری بەرزی دیاربەکر ئەحمەد عارف (١٩٢٧ بۆ ١٩٩١) واتا ئەحمەد عارف لە ١٩٢٧ لە دایکبوە و لە ١٩٩١ کۆچی دوایی کردووە.



ئـــــەی هاوار
لە نێو ئاگردا..
لە نێو تەڵەی قەحپەکاندا..
لە نێو قریشکە و تۆقیندا...
لە کانگای دوومەڵ و لە نێو وەحشی و دڕەندەکاندا..
لە گۆمی ژەخنەبووتا، تەنراو بە چەقۆ..
وەستاویت تاقانە و بێکەس! وای بۆ ئازارت...
وای وای....
تەنها ڕووح و سەری خۆتت پێ ماوە!
بێ پشت و پەنا، بێ بەرگ، پێ خاوس!
لە سەحەردا خەو زڕاو..
لە ژێر چەپۆکی جەلادێکدا..
وای..
چەندم خۆشدەویستی..

ئەمە چی نیشتیمانێکە لە (ئێسکودارەوە) تا ئێرە؟
هێی گیانەکەم!
کێوی گوڵزار، پڕ لە ئافات، پڕ برسێتی..
نە گوڵەکانی ئەپشکوون، نە میوەی گەیوو لە لقەکان دەکەونە خوارەوە...
ئەکێشن بە نێوچەوانمدا..
وەکو «گڕەبەردێك (نەیزەك)» بە کێڵگەیەکدا بدات..
کەرامەت شکاندن، بێ هانایی..
ڕووباری (مونزور و شاهـ مورات) خەڵتان لە خوێن...

وە منیش شـــــاعـــــیرم!
لە پێناوی شەرەفی ڕەنجەدەراندا..
بۆ ناموسی تێکۆشەران..
بە بێ ترس، پاك و بێگەرد..
کە نەبوون بە خۆڵەمێش..
نـــــە وێنەیەك دەگرم..
بە ڕوانینێکی خەمبارەوە..
نە چەند کۆپلەیەك ڕەشەبای یاخی هەڵدەواسم...
وای..
چەندم خۆشدەویستی..

ئازیز، بەڵێ ئێستا..

هەرچەندە دەمێکە دابڕاوین، لێ هەر ئێستا..
دەڵێی بە چەقۆیەك لە تۆ کراومەتەوە..
دەڵێی چڵێکم لە قەدی تۆوە شکێنراوم...
ئەی هۆکاری ژیانم، خانمەکەم، خۆشەویستم..
برینەکەت زۆر قووڵ بووە،
چەخماخەی ئاگریش داناگیرسێ،
دەزانـــــــم!!
لێگەڕێ لە چیاکان (حیساب) یەکلایی دەکەینەوە..
ئومێد و هیوا لە چیاکانە...

بڕوانـــــــە! پێیەکمان وا لە نێو بۆشایی گەردووندا..
کەچی ئەوەی ترمان لە نێو گۆرەوی چنراو و پێڵاوی ڕەنجبەرێکدایە
بڕوانـــــــە! لە بیردۆزی ڕێژەیی و لە فیزیای ئەتۆمی..
لە خۆشمان و عەشقی کوێرەوەری..
لەم زەمەنە نەفرەتییە و بەرخودانەمان.
بۆ زارۆکەکانمان، بۆ خونچەی داهاتوومان..
بۆ هەر یەکێکیان بەرگێك لە ئەرخەوان
ژیانێك پڕ لە خۆشی و گەمە
هێـــــــی گیانەکەم
تۆ تەواوی بکە...

ئـــــەی هـــــاوار ...
تـــــو عەشقی موحەمەد، تـــــو عەشقی عیسا!
تـــــو ئەو تەختە زیوەی لەسەری ڕاکشاوی..
دەیییییی ..
ئەوا بە قوڵنەکەی فـــــــەرهاد کێوەکان دەکوتن،
تاکو بوون بە تۆز...
ستەم دەمی شمشێری لە خوێن و عارەقی لاقەبرغەمدا نوقم کردووە.
زۆر یاخی!
لغاو و تەوقی دەمم، گەر بڵێم «ئاهـــ» دەپسێن.
ئەدی گوڵە کێویلە و گوڵەباخ خوشکن.
ئاوهایە عیشق...
وای چەندم خۆشدەویستی....



* لە تورکیەکەدا دەبێژێ (لە نێو نیشانی جەلادێکدا).
* ئێسکودار ناوچە/گەڕەکێکە لە ئەستەمبوڵ لە دواهەمین کەناری کیشوری ئاسیا.
* مونزور و شاه مورات دوو ڕووباری باکوری کوردستانن.

پانووس:
زۆر بابەتی بڵاگی تایبەتی خۆم: http://www.sianariman.com/
پەڕەی ئەحمەد کایا: facebook.com/ahmetkayakurdi

**سەرچاوەکان:**

(1) ڕۆژنامەی سەباح: http://www.sabah.com.tr/fotohaber/gundem/efsane_isim_ahmet_kaya/25361

(2) ڕۆژنامەی حوریەت:
http://webarsiv.hurriyet.com.tr/2003/11/21/375006.asp

(3) ویکی تورکی:
https://tr.wikipedia.org/wiki/Ahmet_Kaya#cite_ref-sezerbagcan_3-0

(٤) پێگەی ئیسلامی گویندەم
http://www.islamigundem.com/afak-turkusu-sairi-nevzat-celik-konustu-haber-17028.html

(٥) چاوپێکەوتن و فلیمی بەڵگەیی (کۆلارەکەم بە تەڵەوە بووە): لە یوتیوب، ئامادەکردنی گویلتەن کایا و دەرهێنانی ئومێد کڤانچ
www.youtube.com/watch?v=7LWQVr5iryw

(٦) بڵاگی لایەق حەمە (هیوا)
http://layik.wordpress.com بابەتی وەرگێڕدراوی «کێ ئەحمەد کایای کوشت؟» بەستەر: http://tinyurl.com/oe6mllw

(7) ئەحمەد کایا (ویکی سۆرانی) بەشی «پاش کۆچی دوایی»
https://ckb.wikipedia.org/wiki/ئەحمەد_کایا

(8) چرا تیڤی
http://chra.tv/news/index.php/articles/articles/articles/10015-kaya-demucrat

(9) ماڵپەڕی کایا، هەواڵی ڕۆژنامەی تەقویم
http://www.ahmetkaya.com/HaberAyrinti.aspx?id=1053

(10) ڤیدیۆکەی ئەردۆگان لە پەرلەمانی تورکیا
http://www.youtube.com/watch?v=Y-j-BcK2yQM

(11) ڤیدیۆی گۆرانیەکە پێش ئەوەی ئەردۆگان بچێتە سجن لە 1999
http://www.youtube.com/watch?v=Bo84BNwJ4vQ

(12) ڕۆژنامەی تەقویم
http://www.takvim.com.tr/Yazarlar/rasim.ozan/2012/11/20/ahmet-kayayi-oldurenlerden-mutlaka-hesap-sorulacak-2

(13) بڵاگی ڕۆژنامەی میللیەت
http://blog.milliyet.com.tr/cumhuriyet-ve-ahmet-kaya/Blog/?BlogNo=434176

(14) قسەکانی حەسیب قەپڵان لە پەرلەمانی تورکیا 9ی مایسی 2013
www.youtube.com/watch?v=5jf1hH14Gg8

(15) ویکی ئینگلیزی دەنیز گەزمیش
https://en.wikipedia.org/wiki/Deniz_Gezmi%C5%9F

تێبینی: مەرج نییە سەرچاوەکان لەناو بابەتەکەدا بەڕیزبەندیی هاتبن.

**پێداچوونەوە و ڕاستکردنەوەی مێژووەکان و پاکنووسی کۆتایی لایەق حەمە (هیوا)**

# ئەلبومی گۆرانییەکانی ئەحمەد کایا



**ڕێکان مەحمود**

ئەحمەد کایا خاوەنی زیاتر لە ٢٠ ئەلبومی گۆرانییە، هەر ئەلبومێك تام و چێژی تایبەتی خۆی و تایبەتمەندی ستایل و شێوازی تێدا پارێزراوە، هەندێ لەو ئەلبومانە لە دوای مەرگی ئەحمەد کایا بڵاوکراونەتەوە، بەشێوەیەکی گشتی گۆرانی ئەلبومەکانی تێکەڵەیەکە لە ڕەهەندی سیاسی و ئەڤینداری و چینایەتی و هیومانیزمی مرۆڤدۆستانە، هەر لەبەر ئەمەشە لە تورکیا ئەم هونەرمەندە بەهونەرمەندی هەژاران ناسراوە، خۆشی هەمیشە دەیگوت، دەمەوێت گۆرانییەکانم ئەو هەستە هەژارییەی پێوە دیار بێت کەساڵانێکی زۆر خۆم بە دەستییەوە ناڵاندوومە، مرۆڤ پێش هەژار بوون مرۆڤە، بۆیە دەبێـت هەرچی لە ژیاندا دەکات خزمەت بەو هەستە مرۆییەی بکات، لێرەدا کورتە و پوختەو ساڵی کۆمەڵێك لە ئەلبومی گۆرانییەکانی (ئەحمەد کایا) دەخەینە ڕوو.




## ئەلبومی یەکەم:

### مەگری ئەی منالْ

یەکەم ئەلبومی کە زۆر بەتوندی دژی ئەو بارودۆخە بوو ساڵی ١٩٨٥ لە تورکیا درووست بوو، بە تایبەتیش لە ڕووی سیاسییەوە، ئەحمەد کایا بە یارمەتی هاوڕێیانی خۆی ئەلبومێکی دەرکرد بە ناوی «مەگری ئەی منالْ» بۆ ئەم ئەلبومە کایا هیچ هیوایەکی نەبوو کە لەلایەن خەڵکەوە پێشوازی لێبکرێت، تەنها مەبەستی ئەوە بوو بەڕێگەی گۆرانییەکانی هاواری ناڕەزایەتی خۆی بەگوێی خەڵک و دەسەڵاتی ئەودەم بگەیەنێت. چەند ڕۆژ پاش دەرکەوتنی ئەلبومەکە، هێزە ئەمنییەکانی تورکیا کاسێتەکەیان کۆکردەوە بەبیانووی ئەوەی چەند گۆرانییەکی سیاسی تێدا بووە. دوای ناڕەزایەتییەکی زۆر، فرۆشتنی کاسێتەکەی ئازاد کرا. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کایا زیاتر بە ناوبانگ بێت و پێشوازییەکی بەرچاو لە یەکەمین بەرهەمی بکرێت.

## ئەلبومی دووهەم

### دڵتەنگی بۆ غەمەکان

ماوەیەکی کورت پاش پێشکەشکردنی ئەلبومی یەکەم، دووهەمین ئەلبومی بە ناوی «دڵتەنگی بۆ غەمەکان» هەر بەستایل و شێوازی ئەلبومی یەکەم کەوتە بازاڕەوە، پێشوازی باشی لێکرا، بەڵام لە ڕووی ستایل و شێوازی گۆرانی گوتنەوە لە ئەلبومی یەکەم دەچوو.

## ئەلبومی سێهەم

### گۆرانی عەشق

ناوی ئەلبومی سێهەمی «گۆرانی عەشق» بوو. ئەم ناوەش لە شیعرێکەوە وەرگیرابوو بەو ناوەوە کە هی شاعیری تورک (ئولکو تەمەر) بوو، بە هۆی هەبوونی بیری سیاسیەوە چاوەڕێی سێدارە بوو.ئەم ئەلبومەش پێشوازییەکی زۆری لێکرا بە تایبەتیش لە لایەن گەنجانی وڵاتەوە، لە ژێر ناوی عەشق، کایا ڕەخنەی توندی لە سیستەمی سیاسی وڵات گرت.

## ئەلبومی چوارەم

### ساتێك دادێت

ئەلبومی چوارەمی کایا ناوی «ساتێک دادێت» بوو کە هەندێک شیعری (ئولکو تەمەر، ئاتیلا ئایهان و حەسەن حسێن کورکمازی) دەگرتە خۆ، ئەم ئەلبومەش لە چاو ئەلبومەکانی تری کایا جۆرێ وەستان و مەنگی پێوە دیار بوو، هەندێ لە ڕەخنەگران دەڵێن هۆکارەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە شیعرەکانی هەمەجۆر بوون و هێڵێک نەبووە سەرجەم شیعرەکانی ئەلبومەکە بە یەکەوە ببەستێتەوە، ئەمە جگە لەوەی ئاستی تۆمارکردن و کاری تەکنیکی ئەلبومەکەش وەک پێویست نەبوو.

## ناوی ئەلبومی پێنجەم

### دیموکراتی ماندوو

ناوی ئەلبومی پێنجەمی «دیموکراتی ماندوو» بوو. ئەمە دواتر بوو بە نازناوی ئەحمەد کایا کە هەر لەم ئەلبومەی وەرگیرابوو. دیموکراتی ماندوو، ئەم ئەلبومە تورکە ڕەگەزپەرستەکانی وڵاتی زۆر تورەکرد و تەنانەت هەندێ ڕەخنەگری هونەریی و سیاسیش لە ڕۆژنامە بەناوبانگەکانی وڵات کەوتنە لە سەر نووسینی ئەم ئەلبومە و پێیان وابوو گۆرانییەکان هێندەی سۆزی شەقامی سیاسی تورکیا دەوروژێنێت ناچێت بەلای هونەردا، ئەحمەد کایاش جگە لە بێدەنگی هیچ وەڵامێکی ئەو ڕەخنانەی نەدایەوە، بەڵام ئەلبومەکەی هەزارەها دانەی لە تۆمارگەکان لێ دەفرۆشراو کاتێک هەوڵی قەدەغەکردنیشی درا، لە ناو گەنجان و ئەڤیندارانی دەنگی کایا، ئەلبوم و گۆرانییەکانی دەستاو دەستی دەکرد.

## ئەلبومی شەشەم

### هەستە راپەڕین

ئەلبومی شەشەم: کایا لە ساڵی ١٩٨٧ دوای ئاشنابوون لەگەڵ «یوسف خەیاڵ ئۆغڵو» لاپەڕەیەکی نوێی لە ژیانی هونەری خۆی هەڵدایەوە. ئەلبومی «هەستە راپەڕین» کە زۆربەی شیعرەکانی هی یوسف خەیاڵ ئۆغڵو بوو، لە




هەلومەرجی دژواری سیاسی تورکیادا، کایای کردە یەکێک لە بەناوبانگترین و ناڕەزامەندترین گۆرانیبێژی تورکیا. لە ناوی ئەلبومەکەوە دیارە کایا چەند دژی سیستەمی سیاسی وڵاتەکەیەتی، کە پرسیاریشیان لێدەکرد لە بارەی ئەلبومەکەی، بە هێمنییەکەی خۆی دەیگوت «ئەم ئەلبومە باسی سیاسەت ناکات، باسی ئاشتبوونەوەی من و شاعیر (یوسف خەیاڵ ئۆغلۆ)دەکات، بەڵام لە ڕاستیدا ئەمە جفرە بوو، هەمو کەس دەیزانی ناوی ئەلبومەکە بانگەشەیە بۆ ڕاپەڕینی شەقامی تورکیا.

## ئەلبومی حەوتەم

ئەلبومی حەوتەمی هەڵبژاردەیەک بوو لە گۆرانییە پێشکەش کراوەکانی لە کۆنسێرتەکان کە ساڵی ١٩٨٨ خرایە بازاڕەوە. زۆر پێشوازی لەم ئەلبومەی نەکرا، لەبەر ئەوەی پێشووتر زۆربەی گۆرانییەکانی بڵاوببوونەوە و ئاشنابوون بە عاشقان و گوێگرانی دەنگی.

## ئەلبومی هەشتەم

### بەختیار

ئەلبومی هەشتەمی ناوی «بەختیار» بوو لە ساڵی ١٩٩٠ دا پێشکەشکرا. ئەم ئەلبومەش زیاتر کارێکی خودیی بوو، باسی بەختیاری ناخی مرۆڤ دەکات، شتێک باس دەکات وەک خۆی باسی دەکات بوونی نییە، ئەو وەک هونەرمەندێک لە شتێک دەدوێت لە گۆرانییەکانیدا لەسەر زەمینی واقیع بوونی نییە، لەوانە (بەختیاری، ئازادی، مافی مرۆڤ، زمانی دایک..هتد).

## ئەلبومی نۆهەم

### دیواری عەشق

ئەلبومی نۆهەمی بەناوی «دیواری عەشق» هەر لە هەمان ساڵدا پێشکەشکرا. ئەم ئەلبوومەش تێکەڵەیەک بوو لە سۆزی ئەڤیندارانە، بەڵام بە ڕیتم و تایبەتمەندییەکی کاڵی ڕامیاری، کە بە تەنها ئەوانەی گوێگری بەردەوامی کایا بوون لەم جفرەیە تێدەگەیشتن.




## ئەلبومی دەیەم:-

ئەلبومی دەیەمی وەک ئەلبومی حەوتەم هەڵبژاردەیەک بوو لە کۆنسێرتە زیندووەکانی و ساڵی ١٩٩٠ پێشکەشکرا. لەم ئەلبوومەوە وردە وردە چاودێری سیاسی خرایە سەر بەرهەمەکانی و لە ناوبانگ و لایەنگیریی هەزارەها هاووڵاتی تورک و کورد، بۆ ئەم گۆرانییانە هێزە ئەمنییەکان کەوتنە گومانەوە.!

## ئەلبومی یازدەهەم

### تووشی دەردیسەر بووم

ئەلبومی یازدەهەمی بەناوی «تووشی دەردیسەر بووم» ساڵێک دواتر پێشکەشی هۆگرانی کرا. وردە وردە کایا وەک پلان دانانێک بۆ پرۆژەی هونەریی ناوی ئەلبومەکانیشی گۆرانی بەسەردا هات و هەست بەوە دەکرا بیەوێت لەو وڵاتە هەڵبێت.

## ئەلبومی دوازدە

### نزیکم مەبەوە دەنا دەسوتێی

ئەلبومی دوازدەی هەمان ساڵ و بەناوی «نزیکم مەبەوە، دەنا دەسوتێی» خرایە بازاڕەوە. ئەم ئەلبومە نەتەوە پەرستەکانی تورکیا دەیان شیکار و مانای جیاوازیان پێبەخشی، ئەحمەد کایاش لەوەڵامدا وتی «من کاری ئایدۆلۆژی و سیاسی ناکەم، من خەریکی هونەرم، لە هونەردا سنوور نییە، ئێوە بۆ دەتانەوێت سنووری بۆ دانێن.!

## ئەلبومی سێزدەهەم

### ئازار چێشتوو

ئەلبومی سێزدەهەمی ساڵی ١٩٩٣ پێشکەشکرا بەناوی ئازارچێشتوو. لەم ئەلبومەدا کۆکراوەی ئازار و نەهامەتییەکانی خۆی بە دەست نەتەوەپەرستەکانەوە خراوەتە ڕوو، وردە وردە لەم ئەلبومە بەدواوە دەوڵەت ئازادی سنوردارتر کرد و ویستی لە ڕێگەی دادگاوە سنوورێک بۆ کارە هونەرییەکانی دابنێت، بەڵام ئەحمەد کایا چالاکتر و پڕ بەرهەم تر بوو. لە بواری گۆرانی گوتندا!

## ئەلبومی چواردەهەم

### گۆرانییەکانم بۆ چیاکان

ئەلبومی چواردەهەمی ساڵی ١٩٩٤ پێشکەشکرا بەناوی «گۆرانییەکانم بۆ چیاکان» لەم ئەلبوومەشدا وەک هەندێ لە ڕۆژنامەنووسی توندڕەوی تورک ئاماژەیان پێدا، لەم ئەلبوومە بەدواوە کایا دای لە بنی مەنجەڵەکە، لەو کاتەوەی وەک خۆیان ئاماژەیان بۆ دەکرد، ڕۆژانە دەیان تەرمی سەربازانی تورک لە چیاکانەوە دێتەوە بۆ شارەکان، ئا لەم ساتەدا ئەم گۆرانیبێژە گۆرانییەکانی پێشکەشی چیاکان دەکات.!!

## ئەلبومی پازدەهەم

### تێمبگە

ئەلبومی پازدەهەمی ساڵی ١٩٩٥ پێشکەشکرا، بەناوی «تێمبگە» گۆرانییەکانی ئەم ئەلبوومە جۆرێک لوغز و نهێنی تێدا بوو، ڕیتمەکانیشیان خێراتر بوو، بە جۆرێک گوێگر هەستی بە دڵەڕاوکێی ناخی ئەحمەد کایا دەکرد لە وتنی ئەم گۆرانیانەدا.

## ئەلبومی شازدەهەم

### ئەستێرە و ڕەنگدانەوەی لەناو ئاودا

ئەلبومی شازدەهەمی کایا ساڵی ١٩٩٦ پێشکەشکرا و «ئەستێرە و ڕەنگدانەوەی لەناو ئاودا» بوو. لەم ئەلبومەدا گۆرانییەکانی پێشتری خۆی گوتووەتەوە. بەڵام بەڕیتم و میلۆدی و ستایلێکی جوانتر و سەرنجڕاکێشتر، ئەم ئەلبومەی سەدان هەزار دانەی لێفرۆشراوە.

## ئەلبومی حەڤدەهەم

### ڕووبەڕوو بوونەوە لە گەڵ دۆست و دوژمن

ئەلبومی حەڤدەهەمی کایا ساڵی ١٩٩٨ بەناوی «ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ دۆست و دوژمن» پێشکەشکرا. ئەم ئەلبوومەش ڕەنگدانەوەیەکی دورودرێژی ئەو هەستە بوو بەرامبەر بەو نەتەوە پەرستانەی کە لە تورکیا بە ئاشکرا دژایەتی ئەحمەد کایا و هونەرەکەی و زمانەکەی و نەتەوەکەی دەیانکرد، ئەم ئەلبومەش بۆمبێک بوو هەموو نەتەوە پەرستەکانی تورکیای کاس و بێزار کرد.!

## ئەلبومی هەژدەهەم

### خودا ماڵئاوا

ئەلبومی هەژدەهەمی کایا ناوی «خودا.. ماڵئاوا» بوو کە دوای مەرگی و لە ساڵی ٢٠٠١ دا پێشکەشکرا. لەم ئەلبومەیدا گۆرانییەکی کوردی هەیە بەناوی «کاروان» و هەر ئەمەش لە هەموو ئەلبومەکانی جیا کردووەتەوە.



بە تایبەتیش لە ڕووی حەزینی و ڕەهەندی تراژیدیانەوە، باس لەوەش دەکرێت نزیکەی یەک ملیۆن لەم ئەلبوومەی فرۆشراوە.!

## ئەلبومی نۆزدەهەم

### هەندێکیش تۆ بگری

ئەلبومی نۆزدەهەمی کایا کە سێ ساڵ دوای مەرگی ئەو بە هەوڵی ژنە وەفادارەکەی، لەساڵی ٢٠٠٣ دا پێشکەشکرا، ناوەکەی بەمجۆرەیە «هەندێکیش تۆ بگری.»

## ئەلبومی بیستەم

ئەلبومی بیستەمی کایا، کە پێنج ساڵ دوای مەرگی و دیسان بە هەوڵ و کۆششی هاوسەرەکەی لە ساڵی ٢٠٠٥ دا بڵاوکرایەوە، ئەم ئەلبومە هەموو سنوورەکانی ئەوروپا و تورکیای بڕی و پێشوازییەکی کەم وێنەی لێکرا، دەڵێن بەهۆی ئەم ئەلبوومەشەوە بوو کە بە هونەرمەندی ساڵ هەڵبژێراوە و لە وڵاتانی ئەوروپا و تورکیاش پێشوازییەکی زۆری لێکرا.



# ئەحمەد كايا
## ڕابەری مۆزیکی پڕۆتێست لە تورکیا



بەکر شوانی

ئەحمەد كايا، وەک پێنجەم و دوايين منداڵی خێزانێكی كوردی مەڵاتيايی ڕۆژی ٢٨ تشرينی يەكەمی ساڵی ١٩٥٧ لە دايك بووە. باوكی، كرێكاری كارگەيەكی ڕستن و چنين و دايكی، خاتوونی ماڵەوە بوو. كايا سەردەمی منداڵی لەگەڵ خوشك و براكانی و دايک و باوكی ميهرەبانيدا بەسەردەبات. ڕۆژێک باوكی سازێكی بۆ دەهێنێتەوە درێژتر لە باڵای كوڕەكەی كە ئەو كاتە هێشتا تەمەنی ٩ ساڵ بوو. ٢٤ی تەمووزی ١٩٦٦ كە ڕێككەوتی جەژنی كرێكارانە، بۆ يەكەمجار دەبرێتە سەر شانۆ و دواتر هەرگيز ئەو ڕۆژە لەبير ناكات. لە پشووەكانی هاويندا وەک شاگرد لە تۆمارگاكانی فرۆشتنی كاسێتی موزيک يان لای شۆفێری مينی بووسەكانی ناو شار كار دەكات. كاتێک بەشاری براگەوەرەی لەلايەن پۆليسەوە دەستگير دەكرێت، كايا يەكەم گۆرانيی خۆی دادەنێت: "فۆلكسڤاگنێک دەكڕم... ناوی دەنێم بەشار..."

### باركردن بۆ ئيستانبوڵ و گەڕان بەدوای خۆدا

كاتێک ساڵنامە ساڵی ١٩٦٨ پێشان دەدات، كايا دەكەوێتە بەر كاريگەريی بزووتنەوەی ناسراو بە بەهاری شەست و هەشتەوە. ئيدی پانتۆڵی شارلستۆن لەپێ دەكات، قژی درێژ دەكات و كاسێتەكانی "ڕوحی سوو"ی بەڕەچەڵەک ئەرمەنی دەكڕێت. باوكی خانەنشين دەبێت و لە پێناوی دابينكردنی ژيانێكی باشتردا بۆ منداڵەكانی، بۆ ئيستانبوڵ باردەكات و لە بەشە شاری قۆجا موستەفا پاشا دەگيرسێنەوە. يەكەم تێبينی كايا لەبارەی ئيستانبوڵەوە "ترس"ە. ئەو ساڵانێک دواتر لەبەردەم كامێرادا دەربارەی سەرەتای ژيانی خۆی لەو شارە دەڵێت: "قسەم لەگەڵ نەدەكردن، چونكە نەمدەتوانی لەگەڵيان بدوێم. جلوبەرگ و

شێوازی قسەکردنیان جیاواز بوو. هەوڵم دەدا وەک ئەوان بپەیڤم. دەچوومە لای بەرگدروو  پانتۆڵی وەک هی ئەوانم بە دوورین دەدا. دواتر دەمبینی پانتۆڵەکانم لێ نایەت. لە پێی ئەواندا جوان بوو، بەڵام لە من نەدەهات..." کایا نموونەیەک دەربارەی تێنەگەیشتن لە شێوە ئاخاوتنی تورکیی ئیستانبوڵ دەهێنێتەوە و دەڵێت: "کچێک هەبوو لە قوتابخانەکەمان. هەرکەس ئەڤینداریێکی هەبوو، ئەڤینی منداڵانە. ڕۆژێک چووم و پێم گوت: (ئەگەر کەمێک، پێنج خوولەک، قسەت لەگەڵ بکەم، یەکسەر هەڵدێیت) لە وەڵامدا پێمی گوت: (ڕیجا ئێدەرم — تکا دەکەم)... زۆر لە باری لەشم گران بوو، بۆیە منیش گوتم: (منیش ڕیجا ئێدەرم لە تۆ) من ئەو کاتە واتای (ڕیجا ئێدەر) م نەدەزانی. وامدەزانی جنێوە"... کایا کاتێک قۆناغی خوێندنی ناوەندی تەواو دەکات دەچێتە بازاڕی کارەوە، پەی بە شەڕ و ناکۆکییە کۆمەڵاتییەکانی ساڵانی حەفتای تورکیا دەبات. لە کولتوورێکدا دەژی کە تیایدا دیوارێکی پتەو لە نێوان ئیستانبوڵی و کەسانی بەڕەچەڵەک خەڵکی شارەکانی تورکیا قووت کراوەتەوە. کایا دەکەوێتە بەر کاریگەریی مارشی شۆڕشگێڕی و گۆرانییەکانی (ڕوحی سوو) و (زولفی لیوانەلی). بەڵام هەمان کات هەڵوەدای گەڕانە بەدوای دەنگی خۆیدا. هەموو کاتی بێکاریی خۆی بۆ سازژەنین و گۆرانی گوتن تەرخان دەکات و لەو سەردەمەدا نۆبەرەی گۆرانییەکانی دادەنێت. ڕۆژێک لە ئاهەنگێکی زانکۆی بۆگازیچی لە ئیستانبوڵ بۆ یەکەمجار (ڕوحی سوو) دەبینێت. سەرباری خۆشەویستیی زۆری بۆ (ڕوحی سوو)، یەکێک لە گۆرانییەکانی ئەو گەورە هونەرمەندە بەناوی "مەخسوس محەل" لە ڕوانگەی خۆیەوە شیی دەکاتەوە. ڕوحی سوویش پێی دەڵێت: "ساز وەها ناژەندرێت..." بەڵام کایا قسەکەی سوو لە دڵ ناگرێت، چونکە خۆی بە هونەرمەندێکی یاخی دەزانێت و بەدوای خۆیدا دەگەڕێت و خوازیارە شتی نوێ بئافرێنێت.

## سەرەتاکانی بەناوبانگ دەرکردن

سەرەتای ساڵانی هەشتا هاوکاتە لەگەڵ سەرهەڵدان و دەستپێکردنی بەدبەختییەکانی کایادا. پاش تەواوکردنی خزمەتی سەربازی، ژیانی هاوسەرێتی لەگەڵ خاتوو ئەمینە کایادا پێکدەهێنێت. ساڵی ١٩٨٢ "چیغدەم"ی کچیان لە دایک دەبێت و لە هەمان ساڵدا (ئەمینە) لێی جیا دەبێتەوە. ئەو ماوەیە بە گۆرانی و موزیک گوزارە لە خۆی دەکات و دەگاتە ئەو باوەڕەی کە ئیدی هونەرەکەی پێگەیشتووە. بۆیە ساڵی ١٩٨٥ بڕیاری خۆی دەدات، کارەکانی دەنێتە بن باخەڵی و ڕێی "ئونکاپانی" دەگرێتەبەر. بەڵام کۆمپانیاکانی بەرهەمهێنانی موزیک دەست بە ڕوویەوە دەنێن، چونکە ناتوانن شێوازی هونەریی کایا بخەنە قاڵبی



کایا لەتەمەنی ١٢ ساڵیدا









هیچ یەکێک لە شێوازە ناسراوەکانی ئەو سەردەمەوە. وەلێ ئەم بە هاوکاری هاوڕێکانی و بە پشتبەستن بە تواناکانی خۆی یەکەم کاسێت یان ئەلبوومی خۆی دەخاتە بازاڕەوە: "مەگری کۆرپەکەم". بەڵام یەکسەر لە بازاڕدا کۆدەکرێتەوە و ئەمەیش ناڕەزایی زۆری لێدەکەوێتەوە. بابەتەکە دەگاتە ڕۆژنامەکان و دواجار دادگا ناچار دەبێت بڕیاری ئازادکردنی ئەلبوومەکە بدات. گوێگرانی کایا بەزۆری بریتی بوون لە خوێندکارانی زانکۆکان، کەسوکاری گیراوان و قوربانییەکانی کودەتای سەربازیی ساڵی ١٩٨٠ و ئەندامانی ڕێکخراوە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی خوازیاری گەڕاندنەوەی "دیموکراسی" بۆ تورکیا. کایا بە سوود وەرگرتن لە گەشانەوەی ناوی لە ناو کۆمەڵگەی تورکیادا یەک لەسەر یەک ئەلبووم دەردەکات. ئەلبوومی دووەمــی بەناوی "خۆگرتن بە ئـازارەکـانـەوە" دەکەوێتە بازاڕەوە. لە ئەلبوومی سێیەمدا شیعرێکی نەوزاد چەلیکی بە ناونیشانی "گۆرانیی ئاسۆ" دەکات بە گۆرانی و هەمان ناویش لە ئەلبوومەکە دەنێت. . چەلیک ئەو کاتە لەسەر دۆزی "دەڤ سۆل" دادگایی دەکرا و داواکاری گشتی داوای لە سێدارەدانی دەکرد.

### پێکەوەنانی ژیانی هاوسەرێتی لەگەڵ گویلتەن خاتوون و ناسینی یوسف خەیالئۆغلۆ

ئەحمەد کایا ساڵی ١٩٨٦ ژیانی هاوسەرێتی لەگەڵ خاتوو گویلتەن خەیالئۆغلو پێکەوە ناو هەمان کات یوسفی برای گویلتەنی ناسی. خەیالئۆغلو (١٩٥٣ - ٢٠٠٩) کوردێکی زازای دەرسیمی بوو و بە تورکی شیعری گوتووە. ناسینی خەیالئۆغلو سەرەتای قۆناغێکی تری پڕ بەرهەم بوو بۆ کایا. شیعری زۆربەی گۆرانییەکانی ئەلبوومی "دیموکراسیی ماندوو" کە ساڵی ١٩٨٧ کەوتە بازاڕەوە، هی خەیالئۆغلو بوو. ساڵی دواتر ئەلبوومی "ڕادەپەڕم"ی دەرکرد کە تەنیا شیعری دوو گۆرانییان هی خەیالئۆغلو بوو. ساڵی ١٩٨٩ ئەلبوومی "ئاهەنگ-١"ی دەرکرد کە تەنیا لە ساز و گۆرانی پێکهاتووە. هەمان ساڵ ئەلبوومێکی تری بە ناوی "گوڵی گەشبینی" خستە بازاڕەوە کە شیعری زۆربەی گۆرانییەکانی هی خەیالئۆغلو بــوون. ئیدی کایا نەیارێکی ڕووداوە نەرێنییەکانی تورکیا بوو و بە دەنگ و ساز شانی دابووە بەر تێکۆشانێکی سەخت. نەیدەتوانی لە هەموو شوێنێک

کۆنسێرت ساز بکات و زۆر جاریش ئەلبوومەکانی بە تۆمەتی "مایەی مەترسی" کۆدەکرانەوە. ئەو دۆخە لە ژیانی هونەریی کایادا ڕەنگی دایەوە، بۆیە ناوی "تووشی بەڵا بووم"ی بۆ ئەلبوومی یازدەیەمی دانا کە لە ساڵی ١٩٩١دا کەوتە بازاڕەوە. لەگەڵ بەرهەمهێنانی ئەلبوومی یازدەیەم "دەستی لێ مەدە دەسووتێی"دا کۆمەڵێک گۆڕانکاری لە ژیانی کایادا ڕوویاندا و ئیدی گەیشتبووە ئاستێک کە فرۆشتنی ئەلبوومەکانی گەیشتە سەرووی ملیۆنێک. کایا ئەگەرچی لە ژیانی هونەریی خۆیدا سەروکاری لەگەڵ چەندین گەورە ناوی بواری هونەردا هەبوو، بەڵام ئەو هەمیشە خۆی لە خانەی هونەری ڕاستییەکانی کۆمەڵگەدا دەبینییەوە. بە واتایەکی تر، دەکرێت کایا لە تورکیا بە ڕابەری ئەو شێوازەی موزیک دابنرێت کە لە جیهاندا بە "موزیکی پرۆتێست" ناسراوە. کایا سەرباری ئەوەی بە تورکی گۆرانی دەگوت، بە هۆی ناوەڕۆکی گۆرانییەکان و هەڵوێستی شۆڕشگێڕانەی خۆیەوە بەردەوام بە ڕێگای پۆلیسخانە و دادگاکانەوە بوو و خۆی لەو بارەیەوە دەڵێت: "پۆلیسخانەکان بوون بە ناوونیشانی دووەمم". کاتێکیش ویستی بە زمانی دایکی، بە کوردی گۆرانی بڵێت، پەتی قەنارەی پێشان درا و ئاوارە کرا و گۆڕستانی "پیرلاشێز" لە پاریس بوو بە مەنزڵگای ئەو تا ئەو ڕۆژەی تەرمەکەی دەبرێتەوە بۆ نشتیمان، بەڵام نشتیمانێک کە خەون و خولیاکانی ئەوی تێدا بەدی هاتبێت.

## ڕووداوەکانی ١٠ شوباتی ١٩٩٩ و ئاکامەکان

ڕۆژی ١٠ شوباتی ساڵی ١٩٩٩ بۆ ئەحمەد کایا و هۆگرانی ئەو وەک ڕۆژێکی تاریک چووەتە مێژووەوە، چونکە ئاکامی ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژە ئێش و ئازار و دەربەدەربوون و مردن لە نامۆییان لێکەوتەوە. ئەو ئێوارەیە کایا لە ڕێوڕەسمی کۆمەڵەی ڕۆژنامەنووساندا لە هۆتێلی "پرینسێس" خەڵاتی باشترین هونەرمەندی ساڵی وەرگرت و لە وتەیەکدا ڕایگەیاند کە ئەو خۆی کوردە و بەنیازە لە ئەلبوومی نوێیدا گۆرانییەک بە کوردی بڵێت و پاشان کلیپی بکات. هەندێک لە ئامادەبووان بە وتەکانی کایا تووڕە بوون و دەستیان بە فیکە و هاوار سووکایەتییان بە کایا کرد. بەڵام ئەو لە وەڵامدا گوتی: "من لە هەموو شوێنێک گوتوومە باوەڕم بە برایەتیی هەزار ساڵەی تورک و کورد هەیە و باوەڕیشم وایە کە پێویستییان بە برایەتییەکی چەندین هەزار ساڵەی تریش هەیە. من ئەوەیشم گوتووە کە ناهێڵین ئەم وڵاتە پارچە بکرێت..." بەدوای ئەوەدا هونەرمەندی تورک ئەبروو گویندەش چوقۆ و چەتاڵی دەستی خۆی گرتە کایا، هونەرمەند سەردار ئۆرتاچ چووە سەر شانۆ و چەندین دروشمی ڕەگەزپەرستانەی گوتەوە. دواتر پاسەوانەکان بە هەزار حاڵ کایایان لە دەستی ئامادەبووان ڕزگار کرد و لە دەرگای دەرەوە بردیانە دەرەوە. دوو ڕۆژ دوای ئەو ڕووداوە، ڕۆژنامەی "حورییەت" کۆمەڵێک وێنەی کایای بڵاو کردەوە و نووسیبووی گوایە کایا ساڵی ١٩٩٣ لە بەرلین کۆنسێرتی بۆ پارتی کرێکارانی کوردستان-پەکەکە ساز کردووە. کایا لەسەر ئەوە درایە دادگای ئیستانبوڵ و داواکاری گشتی بەتۆمەتی "ناپاکیکردن لە نشتیمان و پروپاگەندەکردن بۆ ڕێکخراوێکی قەدەغەکراو" داوای برینەوەی ١٠ ساڵ و نیو زیندانی بۆ کرد. زۆرێک لە میدیاکانی تورک و هەندێکیش لە هونەرمەندانی تورک داوایان دەکرد کایا لە دار بدرێت. ئەویش کاتێک بۆی دەرکەوت بە ئاسانی لەو داوە ڕزگاری نابێت، ڕۆژی ١٦ حوزەیرانی ١٩٩٩ تورکیای بەجێهێشت. بەڵام لە ئامادە نەبوونی خۆیدا سزای ٣ ساڵ و ٩ مانگ زیندانیکردنی بۆ بڕدرایەوە. کەچی دواتر ئاشکرا بوو وێنەکانی بەرلین ڕاست نین و بەمەبەست دەستکاری کراون. ڕەوەندی کوردستانی لە ئەورووپا بوو بە کەسوکار و خاوەنی ڕاستەقینەی کایا و ڕووی لە هەر لایەک دەکرد، بە خۆشەویستی و ڕێزێکی بێ سنوورەوە پێشوازی لێ دەکرا. کایا ئیدی ببوو بەو دیموکراتە ماندووەی کە لە گۆرانیی "دیموکراتی ماندوو"دا باسی دەکات. ئەو ڕێک دوای ٨ مانگ دەرچوونی لە تورکیا، لە ١٦ شوباتی ٢٠٠٠ لە پاریس بەهۆی ڕاوەستانی دڵەوە کۆچی دوایی کرد. ماوەیەک بەر لە مردنی، هاتە بارەگای کەناڵی "میدیا تیڤی" لە برۆکسێل و لەوێ دوایین دیمانەی تەلەڤزیۆنی لەگەڵدا ساز کرا. ئەو ڕۆژە پێکەوە لە کافتریای



تەلەڤزیۆن دانیشتبووین و قسەمان دەکرد. کاتێک بۆی دەرکەوت من خەڵکی باشوورم، زۆر بە تاسەوە داوای لێم کرد کۆمەڵێک گۆرانیی فۆلکلۆری و سروودی بە شێوەی کرمانجیی خواروو (سۆرانی) بۆ ئامادە بکەم، چونکە وەک باسی کرد، لە بەرنامەیدا بوو لە دوارۆژدا بچێتە کوردستان و کۆنسێرت بۆ جەماوەر بکات. جێی داخە ئەو ئاواتەی کایا بەدی نەهات، بەڵام خۆشحاڵم بەوەی کە ئێستا ئەم هونەرمەندە شۆڕشگێڕ و مرۆڤدۆستە بە چاوپۆشی لەوەی کە بە تورکی گۆرانی گوتووە، لە ناو جەماوەری باشوور و ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا خاوەن ڕێز و خۆشەویستییەکی زۆرە.



# ئەحمەد كایا

## شۆڕشێك لە چوارچێوەی هونەر




کۆسار عوسمان سماقەیی

لەو کاتەی کورد بوون و زمانی کوردی ئەوەندە بچووک کرابووەوە رۆڵە کوردەکان بیریان چووبووەوە کوردن، ئەحمەد کایا لەبەر چاوی هەموو تورکیا و بە ئاشکرا کوردبوونی خۆی دووپات کردەوە و گوتی لە پلانی دایە گۆرانی کوردی بڵێ.

کایا، لە تەمەنی ١٦ ساڵیدا بە تۆمەتی هەڵواسینی پۆستەرەوە خرایە بەندیخانە. دواتر پەیوەندیی بە رێکخراوی یەکینەکانی خەڵک کرد. لەگەڵ چالاکییەکانی ئەو رێکخراوە بەردەوام بوو لە فێربوونی ساز. لە یەکێک لە چالاکییەکاندا کە کۆنسێرتێکی زانکۆی بۆغازیچی بوو لە ئیستەنبوڵ، ئەحمەد بە هونەرمەند روحی سو ئاشنا بوو. ئەو ئاشنایەتییە تروسکاییەکی پڕاو پڕ بوو بۆ ئەحمەدی خنکاو لە تاریکیدا. کایا ئەو هونەرمەندەی هەمیشە بە مامۆستای خۆی دادەنا.

ئەحمەد لە ساڵی ١٩٧٨ لە شارۆچکەی گەلیبۆلوی سەر بە پارێزگای ئیزمیر، کە دەکەوێتە رۆژئاوای تورکیا ئەرکی سەربازیی بەجێهێنا. لە میانی سەربازییەکەیدا گرنگییەکی زۆری بە بەهرەی ژەنیاریی سازدا و بەردەوام بوو لە هونەرە ساواکەی.

دوای ئەوەی لە سەربازی گەڕایەوە لەگەڵ ئافرەتێک بە ناوی ئەمینە، ژیانی هاوسەرگیریی پێکهێنا. لە ساڵی ١٩٨٢ کچێکیان بوو، ناویاننا چیغدەم ، کە مانای گوڵی زەعفەران دەدات. تەنیا بە هۆی نەبوونی و دەستکورتییەوە

ئەمینە رازی نەبوو ژیان لەگەڵ ئەحمەد بباتە سەر و لێی جیابووەوە. ئەوە ئەحمەدی زیاتر تووڕە کرد و وای لێکرد ئەو سیستمە ئابوورییەی وڵات رەتبکاتەوە و چەندین جار لە دژی بوەستێتەوە. لە سەر زاری خۆیەوە ئەحمەد گوتی کە ئەوکاتە بڕیاریدا دژ بە سیستمی وڵات جووڵە بکات.

لە ساڵی ١٩٨٥ بڕیاریدا یەکەمین ئەلبومی گۆرانییەکانی بەناوی (گیرۆدەی دەستی خەم) تۆماربکات. بەڵام لەبەرئەوەی ناوەڕۆکی شیعرەکانی شۆڕشگێڕانە بوون، هیچ دەزگایەکی هونەری ئامادە نەبوو بۆی بڵاو بکاتەوە. هەڵوێستی دەزگاکان نەیانتوانی کایا سارد بکەنەوە. بۆیە بێ هیچ سپۆنسۆرێک بە هاوکاریی دۆستانی یەکەمین ئەلبوومی خۆی بە ناوی (کۆرپەکەم مەگری ) بڵاوکردەوە کە رەواجێکی باشی لە لای خەڵک هەبوو. حکومەتی ئەوسای تورکیا ئەو ئەلبومەی قەدەغە کرد. ئەو قەدەغەکردنە بووە ریکلامێکی باش بۆ کایا. لە سەرانسەری تورکیا گوێی بۆ گیرا و بڵاو بووەوە.

لە ساڵی ١٩٨٦ ئەحمەد کایا لە ڕێی سەزەر باغجار کە خاوەنی ئەو ستۆدیۆیە بوو، کایا گرێبەستی لەگەڵ ئیمزا کردبوو، گولتەن خەیالئۆغلوی ناسی. لە هەمان ساڵدا ئەحمەد و گولتەن هاوسەرگیرییان کرد. کایا بەهۆی پەیوەندیی تۆکمەی لەگەڵ سەلدا باغجان لە گرتووخانە، پەیوەندییەکی تۆکمەی لەگەڵ سەزەری برای دروستکردبوو. گولتەنی خێزانی کایا، هۆنراوەی (شەفەق)ی بۆ ئەحمەد پێشنیارکرد تا بیکاتە گۆرانی. ئەو هۆنراوەیە لەلایەن نەوزاد چەلیکەوە نووسراوە. لەو کاتەی نەوزاد لە ژووری سێدارە بووە و چاوەڕێی لە سێدارەدان بووە. شاعیر توانیویەتی هەستەکانی دڵی برژێنێتە سەر کاغەز و پەیامێک بۆ دایکی بنووسێ. وەنەبێ شاعیر مەبەستی ئاوردانەوە بێ بەوەی مەرگ چاوەڕێی دەکات، بەڵکوو دوای ئەوەی گیانی خۆی بەوپەڕی سەربەرزییەوە پێشکەشی نیشتمانەکەی کرد، دەیەوێ بە دایکی بڵێ چی بکات دوای ماڵئاوایی کردن لە رۆڵەکەی. هەروەها دەردە دڵییەک لەگەڵ دایکی دەکات. دەردە دڵییەک کە بۆ تێگەیشتنی تەنیا پێویستە بچینە ئەو کونجە و جلی سێدارە بکەینە بەرمان.

ئەحمەد کایا تەواوی توانای بەکارهێنا و ئەو هۆنراوە بەرزەی کرد بە گۆرانییەکی وەها، بە بیستنی دڵ و دەروون رادەچڵەکێ.

## هۆنراوەی شەفەق:

**دایە گیان لێرە بۆم مەگەڕێ**
**مەیەرە دەرگا ، ناوم بپرسی**
**ئەستێرە کەوتە سەر قژت دایە**
**توخوا مەیانوەرێنە، مەگری**

**ماوەیەکە رووخسارم بێ بەشە لە ڕیش**
**هەر چاوم لە تروسکاییە**
**راکشاوم و بیر و هەستم**
**چاوەڕێی دەنگی پاسەوانانن**
**بیری مردن دەکەم دایە..**
**لە کاتێکدا شێتییەك داوای ژیانم لێ دەکات**
**ئاە.. خۆزگە بمتوانیایە بیدەم**
**نیشتمانێك بە هەموو ئەو دایکانەی دڵیان لە مشتە و لە تاو رۆڵەکانیان رادەکەن**
**نیشتمانێك وەك دیارییەکی ئامادەکراو**
**رازاوە بەدەستی کوڕان و کچانی وڵات**
**هێندەی خەونەکانم بێ سنوور،**
**هاوشێوەی کۆششەکانم جوامێر**

**هەستی مردن چەندە سەیرە دایە**
**لەمەودوا بە نینۆکەکانم، هۆنراوە شێتانەئاساکان نانووسم**
**نانووسم تا ئەو کاتەی خوێن لە پەنجەکانم دەچۆڕێ**
**بە باوەڕێکی توندەوە سەیری بنمیچی بەندیخانە ناکەم**
**بۆ نموونە، نابم بە باوك، دایە**
**چەندە سەیرە هەستی بوون بە خاك**





**کوژراوی هەموو شەڕەکان منم**
**منم ئاڵاکەم گرتووە و دەیشەکێنمەوە**
**ئافرەتان بە نینۆکیان خاك دەکۆڵن**
**تا بمهێننە ئەم دونیایە**
**من غوربەتم، شەڕ و پێکدادانم، عەشقم..**
**چاوەڕێمبە دایە..**
**بەیانییەك دەردەکەوم**
**بەیانییەك، دایەگیان**
**تەنیا بۆ ڕامالّینی خەمەکانت دەردەکەوم**
**نیشتمانێکی گوڵدارت بۆ دێنم،**
**بە دەنگێکی دیکە**
**بە ڕەنگێکی دیکە**

## کچێکی دیکەی کایا دێتە دونیاوە.

ئەحمەد کایا دوای هاوسەرگیریی لە گەڵ گولتەن خەیالۆغڵۆ، پەیوەندییەکی باشی لە گەڵ یوسف خەیالۆغڵۆی برای دروستکرد و بوونە دوو دۆستی خۆشەویستی یەکتر.

یوسف شاعیرێکی زۆر بەتوانای کوردستانی باکوور بوو. بە شیعرە کاریگەرەکانی توانیبووی ببێتە ڕاگرێکی بەهێز بۆ ئەحمەد کایا. یوسف لە سەرەتادا خۆی دەرنەدەخست و وەک کەسایەتییەکی شاراوە لە دیوی دواوەی بەرهەمەکانی ئەحمەد دەردەکەوت.

یوسف خەیالۆغڵو لە بەرنامەیەکی تەلەفزیۆنیدا بەم شێوەیە باسی یەکترناسینیان دەکات : (ئەحمەد کایام نەدەناسی، ئەو تازە تۆزێک ناودار بووبوو. گولتەنی خوشکم لە ستۆدیۆکەی ئەواندا کاری هونەریی دەکرد. ڕۆژێک گوتی کاکە دەمەوێ بە هاوڕێکەمت بناسێنم ناوی ئەحمەد کایایە، من تێیگەیشتم ئەوکات. ئەوەی ڕاستی بێ تۆزێک تووڕە بووم، بەڵام دواتر گوتم دەی ئاساییە. ئێمە سەردەمیین و خۆمان بە خزمەتکاری ئازادی دەزانین. ئەو کات بۆ یەکەمجار ئەحمەدم ناسی. هەر زوو چووە دڵمەوە. هەستمان کرد دەتوانین یەکتر تەواو بکەین. بۆیە تا دەهات لە یەکتر نزیک دەبووینەوە. دواتر ئەحمەد بڕیاریدا چەند شعرێکم بکاتە گۆرانی. ئیتر لەوەوە دەستمان پێکرد. خەڵکی زۆر جار دەڵێن بۆ یوسف تا ماوەیەکی زۆر بە شێوەیەکی شاراوە خزمەتی هونەرەکەی ئەحمەدی کرد و دەرنەکەوت. نازانم، پێموایە هۆنراوە دەبێ

بخوێنرێتەوە و گوێی بۆ بگیرێ بەڵام مەرج نییە رووخساری شاعیر دەرکەوێ. بۆیە من زۆر درەنگ دەرکەوتم.»

لە ساڵی ١٩٨٧ کایا ئەلبوومێکی بەناوی «یۆرگون دیموکرات» واتا دیموکراتی شەکەت دەرکرد. زۆربەی هۆنراوەکانی ئەو ئەلبومە لە لایەن یوسفەوە نوسرابوون. هەروەها ساڵی دواتر ئەلبومێکی دیکەی بەناوی «باشکالدریۆروم – سەر هەڵدەبڕم» دەرهێنا، کە دوو لە هۆنراوەکان هی یوسف بوون. ئەحمەد لەو دوو سێ ساڵەدا چەندین ئەلبومی دەرکرد. بەتایبەتی لە ساڵی ١٩٩٤ بە دەرکردنی ئەلبومی (شارکیلەرم داغلر+ گۆرانییەکانم بۆ چیاکانە) توانی ژمارەیەکی پێوانەیی تۆمار بکات کە تەنیا ئەو ئەلبومە دوو ملیۆن و هەشت سەد هەزار دانەی لێ فرۆشرا. هەروەها گۆرانیی «ئۆزگور چاغری – بانگەوازی ئاشکرا) کە پڕە لە مانای پەنهان و شاراوە و شادبوونەوەی گەریلاکان بە خانەوادەکانیان، بە تەواوی تەقییەوە. ئەو دێڕەی کە دەڵێ « ڕۆژێ کاکەت دێتەوە لە شاخ، باوەشت پێدا دەکات ڕۆڵەکەم» بووە دروشمی ئەو کەسانەی کە لێی تێدەگەیشتن.

## تۆمەتبارکردنی ئەحمەد

ڕۆژی ١٢ی شوباتی ١٩٩٩ دەستەی ڕۆژنامەنووسانی مەگەزین، خەڵاتیان بەسەر چەند هونەرمەندێک دابەشکرد. ئەحمەد کایا لەکاتی وەرگرتنی خەڵاتەکەی گوتی « لەبەر ئەوەی بە رەچەڵەک کوردم، لە ئەلبومی داهاتوومدا گۆرانییەکی کوردی دەڵێم و کلیپێکیشی بۆ دەکەم. دەشزانم کە مرۆڤە ئازاکان بڵاوی دەکەنەوە.» ئینجا گۆرانیی «دەڕۆم»ی گوت کە یەکێکە لە گۆرانییە بە پێزەکانی. ئەو هۆنراوە کە مانا کوردییەکەیمان لە خوارەوە پیشانداوە، لەلایەن یوسف خەیالۆغلوەوە نوسراوە.

### دەڕۆم

**ئیتر لەگەڵت ناوەستم**
**ئێوارە بۆی دەردەچم و دەڕۆم**
**با حەقم بمێنێ بۆ مەحشەر**
**دەستم لێت دەشۆم، دەڕۆم**



**ئەزیەت مەکێشە لە شوێن خۆتەوە**
**پشێوی نانێمەوە**
**لە سەر نووکی پەنجەکانم**
**وەکو ئاو لێژ دەبمەوە**

**ئیتر دەگەشێیتەوە**
**بەوەی توشم نابیتەوە**
**گلەیی ناکەم ئەمجارە**
**دان بەخۆمدا دەگرم و**
**جێدێڵم ئەم هەوارە**
**واتزانی تاڵییەکان تێکم دەدەن**
**من بەسەر بەڵاکاندا بازدەدەم**
**هەر وەکو فیشەك و ساچمە**
**وەکو چیای گڕکانی**
**دەتەقمەوە و دەڕۆم**

**تەنانەت هەموو شتێ بدۆڕێنم**
**ئەو عەشقە دەفەوتێنم و دەڕۆم**
**بە ئاشکرا لێرە دەڕۆم**
**تەقە لە دەرگا هەڵدەستێنم**
**ئینجا دەڕۆم**

**ئەو گۆرانییەی بۆم نووسیویت**
**لە سازەکەمی دەکەمەوە**
**دەزانی کە من ناگریم**
**دەگرێمەوە و دەڕۆم**

**دەست لە باڵندەکانم هەڵدەگرم**
**ڕۆڵەکەم جێدێڵم و دەڕۆم**
**ئەوەی لێتم وەرگرتووە**
**بۆتی دەگەڕێنمەوە و دەڕۆم**

**هەوڵنادەم چەواشەت بکەم**
**خۆم دەسووتێنم و دەڕۆم**
**دوعای خراپ لە تۆ ناکەم**
**لە سەری خۆم دەدەم دەڕۆم**

هەندێک لە هونەرمەندانی ئەوێ، لە ڕقی بیستی وشەی کورد، چەتاڵ و چەقۆیان ئاراستەی ئەحمەد کایا کرد.

## گۆرانییە کوردییەکەی ئەحمەد کایا

مەبەست لە گۆرانییە کوردییەکەی لە شەوی خەڵاتەکە باسیکرد گۆرانیی «کەرڤان» بوو. کە بڕیار بوو کلیپی بۆ بکات. کەرڤان تاکە گۆرانیی ئەحمەد کایایە کە ئێستا لەبەردەستدابێ.

## سەردار ئۆرتاج چەندین جار پەشیمانی دەربڕی

هونەرمەند سەردار ئۆرتاج دوای ئەو رووداوە چەندین چەتاڵباران کرا. ساڵی ۲۰۱۰ لە کۆنسێرتێکی زانکۆی هاجەتەپە لە ئەنقەرە، سەردار ئۆرتاج بەشێوەیەکی یەکجار چڕ چەتاڵباران کرا و زیانێکی زۆر بەر خۆی و هاوڕێکانی کەوت. لەو بارەیەوە ئۆرتاج لە پرۆگرامێکی تەلەفزیۆنیی ئێن تیڤی گوتی « ۱۱ ساڵ لەمەوبەر.. جارێ ئەوە دەڵێم ئەگەر چەتاڵم ئاراستەی کایا گرتبێ دەستم بشکێ، تەنیا مارشی نیشتمانیم خوێندەوە، چ بزانم ئەوە هەڵەیە. من چەندین جار داوای لێبوردنم کرد. ئەوە سێیەم جارە چەتاڵبارانم دەکەن. لە مەرسین دوو ددانیان شکاندم.»

## ژانی غوربەت

دوای ئەوەی ئەحمەد کایا بە ئاشکرا کوردێتیی خۆی راگەیاند و بڕیاریدا گۆرانی و کلیپ بە کوردی ساز بدات. بڕیار درا دادگایی بکرێ و سزای بەسەردا بسەپێنرێ. کایا بە ناچاری رووی کردە هەندەران و لە پاریسی پایتەختی فەرەنسا درێژەی بە ژیانیدا. کایا زۆر نیگەران و خەمبار بوو لە هەندەران، بەڵام چارەیەکی دیکەی نەبوو. یان دەبوایە دەست لە کورد بوونی خۆی و ناسنامەی زیاتر لە ۲۵ ملیۆن کوردی تورکیا هەڵبگرێ، یان دەبوایە خۆی بکاتە قوربانی لە پێناو پێداگریکردن لەسەر بوونی کورد. ئەوە بوو دووەمیانی هەڵبژارد.

لەو بارەیەوە ئەحمەد کایا لە فەرەنسا گوتی «ئەحمەد هیچ هەڵەیەکی نەکردووە. تەنیا لەبەر ئەوەی گوتوومە کوردم ئەو هەموو خراپەیەم دەرهەق کرا. ئایا ئەوە رەوای حەقە کە لە دایکم، خوشک و براکانم، وڵاتەکەم، خێزانەکەم، منداڵەکانم، دۆستەکانم دوور دەخەنەوە؟!. ئایا ئەوان کورد بوونی من دەکەنە هۆکارێک بۆ چەشتنی ئەو هەموو تاڵییەم. ئەوە بۆ خۆیان و ویژدانیان جێدێڵم».

## مردنی ئەحمەد کایا

کایا نەیتوانی جارێکی دیکە بە خاکەکەی شاد بێتەوە. ئەوە خەمێکی گەورە بوو لای ئەو هونەرمەندە گەورەیە و هەمیشە لە غوربەتێکی سارد وسڕی دوور لە بۆنی خاک و منداڵەکانی خۆری بە ئێوارە دەسپارد و دوای شەوێکی پڕ لە خەم و حەسرەت بەیانیی دەکردەوە.



کایا ئەلبومێکی بەناوی «ماڵئاوا چاوەکەم» دەرکرد. ئەوە بووە ماڵئاوایی ئەحمەد کایا و ڕۆژی ١٦ی تشرینی دووەمی ٢٠٠٠ لە ماڵەکەی خۆی لە گەڕەکی پۆرتەدە ڤێرسایلێسی پاریس گیانی لە دەستدا. ڕۆژێک دوای مردنی، بە ئامادەبوونی پتر لە ٣٠ هەزار کەس تەرمی ئەحمەد کایا لە گۆڕستانی پەرەلاچایس بە خاک سپێردرا.

## گۆڕەکەی ئەحمەد کایا

لەسەر بەشی سەرەوەی گۆڕەکەی ئەحمەد کایا نووسراوە «ماڵئاوا وڵاتە خۆشەویستەکەم» هەروەها ئەم چەند دێڕە لە مۆنۆمێنتەکەی هەڵکەنراوە «نغرۆی خەمێکم وەسفەکەی ناکرێ. دیسان ئێوارە هات لەو غوربەتە، وێڵی ڕەشەبام. لە باوەشی بارانێکم بێگانەیە بە خاکەکەم. ئێوارەی ئەم غوربەتە مەنفا بێدەنگ دەکات».

دوای مردنی، یوسف خەیالۆغلو هۆنراوەیەکی جوانی لەسەر زاری ئەحمەد کایا «ئیتر دەڕۆم» نووسیوە. ئەو هۆنراوەیە جارێکی دیکە هەوادارانی کایای خستە گریانەوە. یوسف بە حوکمی ئەوەی نزیکترین دۆستی کایا بوو، هۆنراوەکەی وەها نووسیوە، ڕێک وا هەستدەکەی گوێت بۆ ئەو گرتووە. پێمان باش بوو ئەو هۆنراوەیە بە پێزەیش وەربگێڕینە سەر زمانی کوردی.

**ئیتر دەڕۆم**
**ئیتر دەڕۆم،**
**تەمەنم قوربانی عەشقێکی بێ بەرامبەر کرد**
**ئیتر دەڕۆم،**
**با خاك ئەو هەموو چیرۆکە خەمناکەم لێ وەربگرێ**
**ئیتر دەڕۆم،**
**کێ ئەو لاشە شەکەتەی غوربەتم دەخاتە گۆڕ**
**ئیتر دەڕۆم،**
**ئێستا کێ ئەو تاوانە جەرگبڕە دەخاتە ئەستۆ؟**
**دڵ و دەروونم پووکایەوە**
**لەم شارە بە بارانە**
**هەڵمبگرن، ژانی فیراقم لێرە جێبێڵن**

**سترانێکی ونبووی سەدان ساڵەم بۆ دەگوتن**
**دەمویست بە سروەیەك لە هەواری تروسکاییەوە**
**چاوەکانتان ماچ بکەم**

**تەنیا سترانێکی بێ گوناه بوو**
**کە سەدان ساڵە لە دڵە ستەملێکراوەکان**
**پەنگ دەخواتەوە**
**لەوانەیە لە یەکەم ڕۆژی مەحشەر**
**ئەو سترانە بەیەکەوە بڵێینەوە**



مەراسیمی بەخاك سپاردنی کایا

چەندەم ئێوە خۆشدەویست،
سەیرکەن بەچی گەیشتین
چۆن بووە بیابانی چۆڵ،
ئەو وڵاتە گوڵزارەی من

ئیتر دەڕۆم
هیچ کەسێکتان، بە هیچ زمانێك،
لێم تینەگەیشتن
من سەرم لەپێناوتان دانا،
کەچی وەفای ئێوە تۆماربارکردنم بوو
ئیتر دەڕۆم
بەرەو دونیایەکی داخراوی بێ پەنجەرە
ئیتر دەڕۆم
دایەگیان، ئیتر دەتوانی ئەستێرەکانی قژت بوەرێنی

دواجار دڵم لە دەستدا
بۆ ئەو سترانە ڕاڕایە
ئیتر رزگارتان بوو لێم
خۆشی لەخۆت تورکیا

بێگومان منیش هەمە
خەون و خەیاڵی خۆم و وڵاتەکەم
لەوانەیە ئەو خەبات و کۆششەم
بەردەوامیی پێ دەدرێ،
لە لایەن دۆستان و ژن و منداڵەکانم

خوایە ئەوە چ زیندانییەکە!
ئەوە چ حیکمەتێکە بەم بەیانییە؟
دوا فیشەك ئەرکی تۆ بوو
بەدڵمەوەی بنێی
ئەی پاریسی دەلال؟

ئیتر دەڕۆم
هیچم نەماوە بۆ گوتن
با هەموو شتێ بە قسەی ئێوە بێ

ئیتر دەڕۆم
باوەڕم نەماوە بەو ژیانە
لە پەنای بەد نمەکیدا
لەوانەیە چەند دێڕێکم بۆ بهۆنێتەوە
شاعیرێك بەناوی خەیالۆغلۆ



# پاریس... پایتەختی میحنەتەکانی کورد



**ڕێبین هەردی**

بیرەوەری ئێمە لەگەڵ پاریسدا مێژوویەکی هەیە. پاریسی ئەدەب و فیکر و فەلسەفە و یاخی بوون، پاریسی نائومێدی گەورە و هەواڵی ناخۆش و گۆڕستانی بڕێک لە مەزنە پیاوانی ئێمەیە: نائومێدی شەریف پاشا لە دۆزینەوەی دەنگێک کە دادپەروەرانە تەماشای کێشەی گەلەکەی بکات، هەواڵی ناخۆشی کۆچی دوایی یەڵماز گۆنای و ئەمڕۆش گۆڕستانی ئەحمەد کایا.

شەریف پاشا، کوچە و کۆلانێکی پاریس نەما بە ناویدا بۆ دەنگی کەسێک نەگەڕێ کە بە کێشەی گەلەکەی بلێ: بەڵێ لە ساڵی ١٩٨٤دا یەڵماز گۆنای هەر لەوێ دەمرێت و لەو گۆڕستانە بەناوبانگەدا دەنێژرێت کە ناوی «پەرلەشەز»ە ئەو ڕۆژەی یەڵماز گۆنای لەوێ نێژرا کەس نەیدەزانی چیرۆکی تراژیدی ئێمە لەگەڵ ئەم گۆڕستانەدا وا بەزوویی کۆتایی نایەت و لە داهاتوویەکی نزیکدا دەبێ بە دوا ئارامگای چەند مەزنێکی دیکەش. تازە چوار ساڵ بەسەر ناشتنی یەڵماز گۆنایدا تێدەپەڕی، سەرکردەیەکی بەناوبانگی کورد کە بەهۆی پیلانێکی ناپاکەوە تیرۆر کرا بوو، هەر لە هەمان گۆڕستاندا نێژرا. دوو ساڵ دوای ناشتنی خەمناکی سەرکردەی شۆڕشی کوردستانی ئێران، هونەرمەندێکی مەزنی کورد بە ناوی ئەحمەد کایاوە کە لە هەڵوێستێکی بێ وێنە و ئازایانەدا، ژیانی ئاوارەیی و دەربەدەریی لە پێناوی کوردبووندا دەگرێتەبەر، لە پاریس کۆچی دوایی دەکات و لە ئێوارەیەکی غەمگینی یەکەم ڕۆژی هەفتەدا، هەر لە هەمان گۆڕستان لە تەنیشت یەڵماز گۆنایەوە، بە خاک دەسپێردرێت. «پەرلەشەز» ئێستا سێ شەهیدی مەزنی لە ناو خۆیدا خەواندووە. یەکەمیان لە دنیای سینەمای کوردیدا بێ وێنەیە،

دووەمیان سەرکردە و ڕووناکبیرێکی گەورەیە کە تا ئێستاش بزوتنەوەی ئەودیو نەیتوانیوە هاوشێوەیەکی بەرهەم بهێنێ، سێهەمیشیان مامۆستایەکی گەورەیە لە دنیای گۆرانی و مۆسیقادا کە لە بواری خۆیدا دووبارە بوونەوەی نییە.

ئەحمەد کایا لە زۆر گۆرانیبێژی تر ناچێت، هونەری گۆرانی لای ئەو، چیدی بۆ سەر گەرمی و خۆشگوزەرانی نییە، بەڵکو گۆرانی لای ئەو هونەرێکی گەورەی قووڵکردنەوەی ماناکانی ژیان و ئازادییە. ئەحمەد کایا لەو گۆرانیبێژانەیە کە لێناگەڕێت، کاتی گوێ لێگرتنی گۆرانیەکانی، ببێ بە کاتی خۆدزینەوە لە ژیان و بەرپرسیارییەکانی. لێناگەڕێت پاش بیستنی گورانییەکی بە سانایی بڕۆیت و وەک ئەوەی هیچت گوێ لێ نەبووبێت. ژیانی بیر دەخستیتەوە، لەو کاتەدا کە وات دەزانی هاتوویت بۆ ئەوەی فەرامۆشی بکەیت. نەبوونی جوانیی لە ژیاندا بیر دەخستیتەوە لە کاتێکدا کە وات دەزانی هاتوویت بۆ ئەوەی لە یادی بکەیت. ئازادی بیر دەخستیتەوە، لە کاتێکدا کە وات دەزانی هاتوویت بۆ ئەوەی پرسیاری ئازادی بۆ ماوەیەک لە خۆت دوور بخەیتەوە. دەنگی کایا، دەنگی کاتی خۆشگوزەرانی و بیرچونەوە و کات بەسەربردن نییە، ئەو کاتە نییە کە دەمانەوێت چەند ساتێکی ڕۆمانسی لەگەڵ خۆمان و خەیاڵماندا بژین. بەڵکو ئەو کاتەیە کە زۆر زیاتر لە دنیا و کێشەکانی نزیک دەبینەوە. کاتێکە کە وامان لێ دەکات قوڵتر بیر لە ژیان و ماناکانی بکەینەوە. دەنگی کایا ئەگەرچی زۆر بە گەرمی خەیاڵمان ئەجوڵێنێت، بەڵام خەیاڵێکە تەریب بە ژیان و واقیع و چاوەڕوانییەکانی. خەمێک لە دەنگی کایادا هەیە کە بیری نائومێدیت ناخاتەوە، بەڵکو بیرت بۆ ناڕازیبوون و یاخیبوون و دژایەتی واقیعێک ئەچێت کە ئەبێت بگۆڕدرێت و شایەنی ژیانی مرۆڤ بێت. خەمێکە لەبەر ئەوەی لە واقیع و ژیانەوە دێت، هەر دژی ئەو واقیع و ژیانەش هەڵوێست وەردەگرێت.

دەشێ تۆ لە ئەحمەد کایا نەگەیت، دەشێ مانای ئەو هۆنراوە تورکیانە نەزانیت کە دەیچڕێ. بەڵام ئەو خەمە قوڵەی ناو دەنگی ئەحمەد کایا و ئەو هەڵبژاردنە جوانانەی بۆ ئاوازی گۆرانییەکانی، بەسە بۆ ئەوەی پێت بڵێ تۆ لە بەردەم گۆرانیبێژێکی ئاساییدا نیت. ئەو دەنگە غەمگینە و ئەو جدییەتە لە شێوازی وتن و قوڵبوونەوە ئەفسوناویە لە ناو وتە بە وتەی هۆنراوەدا، بەسە بۆ ئەوەی پێت بڵێ تۆ لە بەردەم هونەرمەندێکی گەورەدایت کە ئەگەر چی تێشی ناگەیت، بەڵام ناچاری گوێی لێبگریت و بیرت بکەوێتەوە کە بە ڕاستی دەمێکە ئومێد دەخوازیت گۆرانیبێژێکی کورد ببینی ئەوەندە ڕێز لە گۆرانی بگرێ و ئەوەندەش لە شێوازی وتندا جدی بێت. ئەوانەش بەر لە هەڵوێستە بێوێنەکەی، گوێیان لە دەنگ و ئاهەنگەکانی لە ناو تورکیادا بووبوو، دەیانزانی مەحاڵە ئەم هونەرمەندە مەزنە بەم هەموو جدیەتە و خەمی ڕاستگۆیانەی گۆرانییەکانیەوە، بتوانێت تا سەر تەحەمولی دەوڵەتی فاشی تورکیا بکات و بە بێدەنگی (وەک زۆرێکی دی) هەر سەرقاڵی پارە کۆکردنەوە و ناوبانگ دەرکردن و دەرکەوتن بێت لە کەناڵە جیاوازەکانی تورکیاوە. ئەوانەی لە زووەوە گوێیان لە ئەحمەد کایا ببوو، دەیانزانی ڕۆژێک دێت و چیدی تەماعی پارە و ناوبانگ بە ڕاستگۆیی گۆرانی و ئاوازێکی ناگۆڕێتەوە. بەڕاستیش کایا وایکرد و پشتی لە هەموو تەماعێک کرد و لایەنگری گەلێکی هەڵبژارد کە ئەگەر چی لەمڕۆدا سێ سەتەلایتی هەیە، بەڵام جگە لە یەکێکیان، کەسیان هەواڵی مردنەکەشی بڵاو نەکردەوە. من دڵنیام گەر ئەم هەڵوێستەی دوایی ئەحمەد کایا نەبوایە، ئێستا هەموو کەناڵەکانی تورکیا بە پرسە و کۆچی دوایی ئەوەوە سەرقاڵ ببوون. بە داخەوە گەورەیی ئەحمەد کایاش لەناو شەڕ و ناکۆکی حیزبە کوردیەکاندا (وەک زۆر شتی دی) بوو بە ژێر لێوەوە و ئەو ڕێزەی لێنەگیرا کە شایەنیەتی، نەک هەر لەبەر ئەوەی هەڵوێستێکی سیاسی مەزن و بێوێنەی لە خۆی پیشانداوە، بەڵکو لەبەر ئەوەی کۆمەڵگایەک زۆری دەوێت بۆ ئەوەی هونەرمەندێکی وەک ئەحمەد کایا بەرهەم بێنێت. ئەحمەد کایا مرد و تەنها ئەو کەسانەش بۆی گریان کە ناسیبویان و زانیان هونەری گۆرانی چ بەهرەیەکی مەزنی لە دەست داوە. ئەوانەشی ناسیان و نەگریان، زانیان کە بەمردنی، ژیان چ جوانی و چ دەنگێکی پڕ لە خۆشەویستی دۆڕاندووە. ئەوانەشی کە هەر نەیانناسیبوو، نەیانزانی لە تەنیشتیانەوە ژیانی خۆیان چ هونەرمەندێکی دۆڕاندووە کە بێ ئەوەی بیان ناسێت بە ڕاستگۆییەوە گۆرانی بۆ ژیان و ئازادییان دەگوت.

**تێبینی: ئەم وتارە لە ساڵی ٢٠٠٠ دا لەگەڵ مردنی ئەحمەددا کایادا نووسراوە و لە ڕۆژنامەی هاوڵاتیدا بڵاو کرایەوە. ئێستا تەنها دەستکاریەکی بچوکم کردووە.**



# مەزهەری خالقی: بریا کورد چوار ئەحمەد کایای هەبوایە!

هونەرمەندی بەناوبانگی کورد مەزهەری خالقی، لەم چاوپێکەوتنە تایبەتەدا بۆ ڕۆڤار، باس لە هونەر و موزیك و ستایلی کارکردنی ئەحمەد کایا دەکات، خالقی پێی وایە کایا بە هەستێکی بەرزەوە گۆرانی دەڵێت و باشترین شیعر بۆ گۆرانییەکانی هەڵدەبژێرێت، باشترین میلۆدی بۆ دادەنێت، باشترین موزیکی داناوە، ئەحمەد کایا هونەرمەندێکی گەورەیە بەمانای وشەی گەورەیی. هەر لەم دیمانەیەدا خالقی ڕەخنە لەوە دەگرێت کە تا ئێستا وەك پێویست لە کوردستانی باشوور کار بۆ ناساندن و شیکاری گۆرانییەکانی ئەم گۆرانیبێژە مەزنە نەکراوە، لەبەر ئەوە زۆر ناسراو نییە لای هاوولاتیان.

چاوپێکەوتن: ڕۆڤار

***وەك گۆرانیبیژێکی ناوداری کورد، تاچەند لەگەڵ ئەو بۆچونانەدایت کە پێی وایە ڕەهەندێکی سیاسی لە پشت ناوبانگی ئەحمەد کایا و هونەرەکەیەوە هەیە و ئەوەش بووەتە هۆی ناوبانگ پەیداکردنی؟**

– ئەگەر ئەمە وابێت، ئەوا ئەحمەد کایا گەورەترین خزمەتی بە موزیک و هونەری کوردی کردووە. من ئەحمەد کایا لە پۆلی یەڵماز گوینای دادەنێم، چونکە ئەم دوو هونەرمەندە هەر دووکیان توانییان لە ڕێگەی دوو لایەنی هونەرەوە کەموزیک و سینەمایە دەنگی مەزلومییەتی کورد بگەینن بە دەرەوەی خۆمان، بۆیە هونەرمەندی کورد بە سرووشتی خۆی کارەکتەرێکی سیاسییە، بەتایبەتیش لە کوردستانی باکور، لەبەر ئەوەی کەشی سیاسی باڵی کێشاوە بەسەر وڵاتەکەیاندا، ئەو شوانە نەخوێندەوارە دەنگخۆشە لە چیاکانی کوردستانە لاوکێک دەخوێنێتەوە لای من ئەو لاوکە مێژووی شێخ مەحمود و شێخ سەعیدی پیرانە، چونکە مێژوو لەرێگەی هونەرەوە بگێڕێتەوە بێگومان نەمرتر و کاریگەرترە تا لە ڕێگەی نووسراوەوە، کولتوور و موزیک پەیامی نەتەوەیی ئێمە لە چاخێکەوە بۆ چاخێکی تر دەگەیەنێت، لە شارێکەوە بۆ شارێکی تر، لە بەشێکی کوردستانەوە بۆ بەشێکی تر، لەبەر ئەمانە ڕەنگە ڕەهەندی سیاسی هونەرەکەی کایا ڕۆڵی هەبێت لە ناوبانگی بەڵام هەموو شت نییە، بیریشمان نەچێت ئەحمەد کایا لە رووی موزیک و میلۆدی و توانای دەنگییەوە ئاستێکی زۆر بەرزی هەبوو، کە کەس ناتوانێت نکولی ئەم ئاستە بکات، هەر ئەمەش وایکردووە هەر ئەلبومێکی بەسەدان هەزار دانەی لێ بفرۆشرێت و گوێگر و هەواداریکی زۆری لە سەرتاسەری دونیا هەبێت.

ئێمە تا ئێستا کە کولتوورەکەمان بەنەمری ماوەتەوە، ئێمە تا ئێستا زمانەکان بە کوردی ماونەتەوە لە هەرچوار پارچەی کوردستان بەشێکی هەرە گەورەی بۆ هونەرمەندی دەنگبێژ دەگەڕێتەوە، پێم وابێت نووسەران و مێژووناسانی ئێمە بۆ مانەوەی نەتەوەکەمان لە بەیتبێژانی کورد زیاتریان نەکردووە، چونکە دەنگبێژێکی کورد کاتێک باس لە ئەنفال دەکات باسی ئەو زوڵم و ستەمە دەکات کە لە میللەتی کورد کراوە، ئەگەر لە ڕابردوودا ئێمە میدیایەکی چالاکمان نەبووە بۆ گێڕانەوەی ڕووداوە مێژووییەکانی میللەتەکەمان، ئەوا بەیتبێژان ئەو ڕۆڵەیان بینیووە، بۆیە ئێمە لە ئینستیودی کەلەپووری کوردی زۆر کارمان لەسەر هونەر و فۆلکلۆر و کولتووری کوردستانی گەورە کردووە، کە لە داهاتوودا کاریگەرییەکانی دەردەکەوێت.

***بەدەر لەم هەوڵانەی ئێوە، پێت وایە وەك پێویست ئێمە لە کوردستانی باشوور توانیبێتمان ئەو سەروەتە گەورەیەی بواری موزیك و کەلەپوری کوردی لە پارچەکانی کوردستان بەگشتی و لە باکوور بەتایبەتی زیندوو بکەینەوە و کاری لەسەر بکەین؟**

– بێگومان نەخێر نەمان توانییوە، چونکە ئەو سنوور و مەرزەی بە چواردەورماندا کێشاویانە بە ئاسانی ناسڕێتەوە، ئەمە یەک، دووەم کارەکە جیاوازە، بۆ نمونە دوای ڕوخانی حکومەتی عێراق ئێمە لە کوردستانی باشوور ماوەی زیاتر لە ٢٠ ساڵە حکومەتی خۆبەڕێوبردن بەڕێوە دەبەین، ئەو زوڵم و زۆرەی لە کوردستانی باکور هەبوو لە باشوور نەبوو، کەواتە گرفتەکان جیاوازە .بۆیە دەبینین ئەم حاڵەتە ڕەنگدانەوەی جیاوازی لای هونەرمەندان و نووسەرانی کورد لە باکور جیاوازترە، ئەوان لە ئێمە زیاتر داخ لە دڵترن بەرامبەر بە چەوسێنەرانیان، بۆیە هونەرەکەیان ڕەهەندێکی نەتەوەیی و ناسیۆنالیزمی و شۆڕشگێڕی هەیە، دەبینین ئەم هەستە لە لای زۆر هونەرمەند هەیە بێگومان



سەرمەشقیان ئەحمەد کایایە. من بۆخۆم بەشتێکی ئاسایی دەبینم و دەبێت واش بێت، دەبوایە لەم چەند ساڵەدا کارێکی زۆرمان لەسەر بەرهەمی هونەریی و فۆلکلۆری و کولتووری کورد لە پارچەکانی کوردستان بکەین.

***ماوەیەك پێش ئێستا و دوای مردنی ئەحمەد کایا، بۆ یەکەمینجار سەرۆك کۆماری تورکیا عەبدوڵلا گویل خەڵاتی هونەرمەندی ساڵی بەخشییە کایا، بە بۆچوونی تۆ ئەم خەڵاتە هیچ بایەخ و کاریگەرییەکی هونەریی هەیە، بەتایبەتیش ئێستا لە تورکیا جۆرێك لە دیالۆگ لە نێوان کورد و تورکدا هەیە ؟**

– بەڵێ پێم وایە بایەخێکی یەکجار گەورەی هەیە، ڕاستە ئەم هەنگاوە کارێکی سیاسییە بەدیوێکی تریشدا ئەم ناساندن و ناسینی کوردە لە لایەن سەرۆک کۆماری ئەو وڵاتەوە، بریا کورد چوار ئەحمەد کایای هەبوایە، کاتێک من دەبینم ساڵانە کەناڵی – (بی.بی.سی)- فیلمەکانی پیشان دەداتەوە، کە دێتە سەر فیلمەکانی یەڵماز گوینای دەڵێت (گوینای هونەرمەندێکی کوردە). ئەمە بۆ ئێمە زۆر دڵخۆشکەرە، ئەمانە پێیان دەڵێن پلانی کولتووری و فەرهەنگی ئێمە وەک کورد زۆرمان پێویستە لانی کەم بۆ ناساندنی نەتەوەکەمان ئەم پلانەمان هەبێت، بەڵام لە ڕاستیدا نیمانە و وەک پێویست بایەخمان بەم سەرەوەتە گەورەیە نەداوە.

***باسی (بی.بی.سی) تان کرد کە باسی یەڵماز گوینای کردووە وەك هونەرمەندی کورد، پێتان وایە لە کوردستانی باشوور لەگەڵ بوونی سەدان دەزگای میدیایی و خانەی چاپ و بڵاوکردنەوە و بنکەی هونەریی وەك پێویست توانیبێتیان هونەریی کوردی یەڵماز گوینای یان ئەحمەد کایا یان سەید عەلی ئەسغەری کوردستانی و دەیان ناوی تر زیندوو بکەنەوە؟**

– پرسیارێکی زۆر بەجێیە کە ئاماژەتان بۆ کرد، دەمەوێت لەم پرسیارەی تۆوە لێرەدا شتێک بڵێم، ئەمە داخێکە لە دڵی من و تۆ و هـەزاران کەسی تردایە، کە ئێمە ئەو سەروەتە نەتەوەییانەی کە دەتوانین خۆمانی لەسەر بونیاد بنێین ئەو کەسانەمان وەک پێویست نەناسیوە، نایەتەوە بیرم فێستیڤاڵێکی سینەمایی کرابێت بەناوی یەڵماز گوینایەوە، تا ئێستا ئەم کارەی ئێوە نەبێت لە دەزگای سەردەم زۆر بەکەمی کار لەسەر ئەحمەد کایا کراوە، هەربۆیە کایا ئەوەندەی لە کوردستانی باکور و ئەوروپا دەناسرێت و بەناوبانگە لە کوردستانی باشوور زۆر بەکەمی دەناسرێت، کە دەڵێم پلانی کولتووریمان نییە مەبەستەکەم ئەمەیە.

***ئەحمەد کایە ژمارەیەکی زۆر گۆرانی و زیاتر لە بیست ئەلبوومی هەیە، بۆچی لەم بەشەی کوردستان هەوڵی ژیاندنەوە و زیندوو کردنەوەی نادرێت، ئایا ئینستیوتی کەلەپوری کورد کە تۆ سەرۆکی ئەو ئینستیوتەی، بۆچی کارتان لەسەر نەکردووە؟**

– گۆرانییەکانی کایا دوو بەشن، یەکەمیان گۆرانییەکان خۆی دایناوە یان بۆیان داناوە، دووەمیان کایا کەمتر گۆرانی فۆلکلۆری کوردی وتووە، گۆرانییەکانی زیاتر سیاسی و بۆ چینی هـەژاران و چەوساوەکان بووە،





ئەگەر لە بواری فۆلکلۆردا کاری بکردایە بەدڵنیاییەوە بۆ ئێمە دەرفەتی زیاتر بوو بۆ کارکردن تێیدا، لەبەر ئـەوەی گـۆرانـی فۆلکلۆری نـەوتـووە تۆزیک لەگەڵ کارکردنی ئێمە جیاوازە، ئێمە لە ئینستیوتی کەلەپور، زیاتر کاری فۆلکلۆری و کولتووری کۆن دەکەین، لە بـارەی کارەکتەری هونەریی ئەحمەد کایا دەتوانین وەک هونەرمەندێکی هاوچەرخی کورد مامەڵەی لەگەڵ بکەین، کە هەندێ ئیشمان کردووە بەڵام زۆر نییە و هێندەی باڵای هونەریی ئەو نییە، ئەو هونەرمەندێک بووە بە کوردی و تورکی گۆرانی وتووە و بۆ کورد کـاری کـردووە، پێویستە لە هەمو لایەکەوە کار بۆ زیندووکردنەوە و پاراستنی بەرهەمەکانی بکەین.

***بەدەر لە ئەحمەد کایا، ئێوە وەك ئینستیوتی کەلەپووری کورد، هیچتان کردووە بۆ پاراستنی بەرهەمی هونەریی هونەرمەندانی کوردستانی باکور؟**

– بەڵێ کاری یەکجار زۆرمان کردووە، بەرهەمی چەندین هونەرمەندی باکوری کوردستانمان کۆکردووەتەوە و لەئەرشیفدا پاراستوومانە، کە ڕەنگە لە داهاتوودا بەها و کاریگەریی پاراستنی ئەو بەرهەمانە دەرکەوێت، لەبەر ئـەوەی کوردستانی باکور سەرچاوە و چاوگی دەیان بەرهەمی گەورەی هونەریی و فۆلکلۆرین و کەمتر لایان لێکراوەتەوە.

***وەك مەزهەری خالقی، وەك مۆزیسیان و گۆرانیبێژێك تاچەند چێژ لەدەنگی ئەحمەد کایا دەبینیت؟**

– بەڕاستی کایا بە هەستێکی بەرزەوە گۆانی دەڵێت، کایا باشترین شیعر بۆ گۆرانییەکانی هەڵدەبژێرێت، باشترین میلۆدی بۆ دادەنێت، باشترین موزیک، من وەک گۆرانیبێژێک حەز بەکارەکانی دەکەم و زۆر لام پەسەندن، کە بێگومان هونەرمەندێکی گەورەیە بەمانای وشەی گەورەیی، بۆیە لام پەسەندە و گوێ لە گۆرانییەکانی دەگرم.من ئەو وەک گۆرانیبێژێکی چەرخی ئەمڕۆ ناو دەبەم، نەک پێشتر و گۆرانیبێژە فۆلکلۆرییەکانی تری کورد.

***پێت وایـە ئەگەر بکرێت هەموو گۆرانی و ئەلبوومەکانی کۆبکرێتەوە و بپارێزرێن دەتوانرێت ببێتە ستایلێك لە گۆرانی و مۆزیکی ڕەسەنی کوردی؟**

– بێگومان ئەوە کارێکی زۆر باشە، پێویستە هەنگاوی وا لە پێشدا لە کوردستانی باشوورەوە بنێرێت، لەبەر ئەوەی ئەم بەشەی کوردستان ئازادە و حوکمی خۆمان بەڕێوە دەبەین، بەڵام ئەم کارەش ئەوەندە ئاسان نییە و بڵێین با بە یەک دوو ڕۆژ تەواو بێت، ئەوە پلان و کارکردن و هیلاکی زۆری دەوێت، دەبێت ئۆرگان و لایەنی فەرمی پێی هەڵسێت.

*** لەهەرێمی کوردستان لایەنی فەرمی بەتەنها وەزارەتی ڕۆشنبیرییە، ئەو ناتوانێت بەو کارە هەڵسێت؟**

– نەخێر وەزارەتـی ڕۆشنبیریی ناتوانێت، لەبەر ئەوەی پلانی هونەریی نییە، لەبەر ئەوەی خەونی گەورەیان نییە بۆ کاری کولتووری، لەبەر ئەوە ناتوانن بەو کارە هەڵسن، ئەوە کاری پرۆفیشناڵیی و کاری دەزگای تایبەتمەندە کە پێویستە بەرهەمەکان بە ئاستێکی کوالیتی زۆر بەرز بپارێزرێن.





# ئەحمەد كایا پێش مردنی: حەزدەكەم لە هەرێمی كوردستان كۆنسێرتێك سازبكەم.!

**چاوپێكەوتن: ژاك دیفۆرس**
**وەرگێڕانی لەفەڕەنسییەوە: شیروان حەكیم**

**ئەحمەد كایا، هونەرمەندی بەناوبانگی كورد، دوای نزیكەی ٨ مانگ لە بەجێهێشتنی وڵاتەكەی خۆی، بە خۆشحاڵییەوە ڕەزامەند بوو ئەم چاوپێكەوتنە كراوەیە لە یەكێك لە كافییە كولتوورییەكانی پاریس بۆ سایتی (nwes ٥.tv)ی نیمچە فەرمی فەڕەنسا سازبكات، چاوپێكەوتنەكەش ڕۆژی ٢ ی شوباتی ساڵی ٢٠٠٠ سازكراوە، بە داخەوە دوای تەنها دوو هەفتە بەسەر ئەم چاوپێكەوتنەدا، كایا بە هۆی نەخۆشی دڵەوە كۆچی دوایی كرد، گفتوگۆكە پرسیار و وەڵامی خێرایە بەڵام پڕن لە زانیاریی لەسەر بۆچوون و تێڕوانینی ئەو هونەرمەندە بۆ داهاتووی كاری هونەریی خۆی و گەڕانەوە بۆ وڵاتەكەی و پڕۆژە و كاری نوێی هونەریی.**

***ماوەی چەند مانگێکە لە پاریس دەژیت، بەتەما نیت بگەڕێتەوە بۆ وڵاتەکەی خۆت؟**

– بە ئارەزووی خۆم نەهاتووم بۆ پاریس تا بە ئارەزووی خۆم بگەڕێمەوە، من غەریبایەتی نیشتیمانم ڕۆح و گیانی هەلا هەلا کردووم، ئەوەی بۆی دەژیم دووری نیشتیمانە و هیچی تر.!

***ئەی هونەرەکەت، کەم هونەرمەندی کورد هەیە هێندەی تۆ داهاتی بەرهەمی هونەریی هەبێت، بەڵام تۆ دەڵێیت تەنها بۆ دووریی نیشتیمان دەژیم، ئەی بۆ هونەرکەت ناژیت؟**

– ئەم دوو شتە جیاوازن، هونەر و گۆرانی و مۆزیک سرووتێکی ڕۆحییە و لەگەڵ ناخدا دەژی، دووریی نیشتیمان حاڵەتێکی سایکۆلۆژییە و پەیوەستە بە یادەوەری مرۆڤ بۆ ئەو شوێنەی تێیدا لەدایک بووە و ئەو شوێنەی تێیدا ژیاوە و ئەو شوێنەی تێیدا گەورە بووە.

***ماوەیەکی کەمە لە پاریس دەژی، کەمترە لە ساڵێك، بەڵام ئۆقرەت لێبڕاوە و شارە و شار و وڵات بە وڵاتی ئەورووپا دەگەڕێیت و کۆنسێرت و چاوپێکەوتن ساز دەکەیت و هێرش دەکەیتە سەر بەرپرسانی وڵاتەکەت، هۆی ئەم حاڵەتەش هەر بۆ لایەنی سایکۆلۆژیت دەگەڕێتەوە؟**

– پرسیارەکەت وانییە، ڕاستە من چەندین شاری فەرەنسا و چەند وڵاتێکی وەک ئەڵمانیا و بەلجیکا و هۆڵەنداو سوید گەڕاوم، بەڵام گەڕانەکەم چالاکی هونەرییە و چاوپێکەوتنە لەگەڵ میدیای کوردی و هاووڵاتیانی کورد، من چەند چاوپێکەوتنێکم کردووە، یەکێکیان لەگەڵ (med t.v) بووە، بە پێچەوانە، نەک هێرشم نەکردووە بەڵکو بە تەنها باسی خۆشەویستی خۆمم کردووە بۆ نیشتیمان و نەتەوەکەی خۆم.

***ئەو تەلەفزیۆنەی تۆ ئاماژەی پێ دەدەیت، لە لایەن گرووپێکی توندڕەوی تیرۆرستەوە بەڕێوە دەبرێت، ئایا دەکرێت تۆ هونەرمەندێکی گەورە لە تەلەفزیۆنێکی وا چاوپێکەوتن ساز بکەیت؟**

– ئەم قسەیەت ئیتیکی ڕۆژنامەنووسیی نییە، ئەوە تورکە توندڕەوەکانن بەو گرووپە دەڵێن تیرۆرست، من ئەندامی ئەو گرووپە و ئەندامی هیچ پارتێکی سیاسی کوردی نیم، بەڵام ئەوەندە دەزانم لەکوێی دونیادا هەیە میللەتێک خەبات بکەن بۆ ئازادی، ناو ببرێن بە تیرۆرست، ئەمە ئەوپەڕەی بێ بەهایی ئەو سیستەمە سیاسییە دەردەخات کە ئەمڕۆ دەسەڵاتدارە.

***ببورن هونەرمەندی بەڕێز، من ئەو مافەم نییە وەك ڕۆژنامەنووسێك دادگایی تەلەفزیۆن و گرووپێك بکەم وبە تیرۆرستیان ناو ببەم، بەڵام ئەوەی هەیە یەکێتی ئەورووپا و ئەمەریکا و ڕێکخراوە مرۆییەکان ئەو گرووپە بە تیرۆرست دەناسێنن، چونکە خەڵکی سڤیل دەکوژن؟**

– من نامەوێت لەسەر ئەو پرسە قسە بکەم، ئەوە جێدێڵم بۆ سیاسییەکان، بیست ساڵە کوڕ و گەنجی کورد لە چیاکان دەکوژرێت، کێ دەیکوژێت؟ تورکەکان دەیکوژن.! ئەی ئەوان تیرۆرست نین؟ ناخوازم لەسەر ئەم پرسە درێژە بەم گفتوگۆیە بدەم.!

***هۆی سەرەکی هەڵهاتنتان لە وڵات بۆچی دەگەڕێتەوە؟**

– ئازادی.. ئازادی..ئازادی.. لەسەر ئەوەی بە تەنها وتم لە ئەلبوومی داهاتومدا گۆرانییەک بە زمانی دایکم دەڵێم، بەداخەوە دەستەبژێری وڵات، تورکە توندڕەوەکان، هەندێ ڕۆژنامەی زەرد و ئاگر خۆشکەری وڵات داوای دەرکردن و زیندانی و تەنانەت داوای ئەوەیان لێدەکردم دەبێت دەوڵەت لە سێدارەم بدات، ئافەرم هونەرمەندی مرۆڤدۆست، لەسەر ئەوەی هونەرمەندێک بیەوێت بە زمانی دایکی گۆرانی بڵێت داوا بکرێت لە سێدارە بدرێت.!

***کارەکانت لێرە باش دەڕۆن، مەبەستم کاری هونەرییە؟**

– زۆر نییە هاتووم نزیکەی ٨ مانگە وردە وردە خەریکە دەکەومە سەر خۆم و کار بۆ ئەلبوومی نوێ دەکەم.

***بە تەمانیت لە پاریس کۆنسێرت بکەیت؟**

– لە ئێستادا بەرنامەی وام لەمێشکدا نییە، لە داهاتوودا ڕەنگە شتی وا هەبێت.

***ئەی لە وڵاتەکەی خۆت ئەگەر دەوڵەت ڕێگەت بدات پێت خۆشە کۆنسێرت ساز بکەیت؟**

– ئەگەر بهێڵێت بژیم بە ئازادی ئەوە هەموو شتێکە بۆ من.

***کورد لە زۆرێك لە وڵاتانی ئەورووپا دەژین، داوای کۆنسێرتیان لێ نەکردوویت؟**

– بێگومان، بەتەمام لە نەورۆز و جەژنی نەتەوەیی کورددا چەند کۆنسێرتێک ساز بکەم.

***ئەی بە تەمانیت لە کوردستانی عێراق کۆنسێرت ساز بکەیت؟**

– زۆرجاری تریش دۆستانم ئەم پرسیارە دەکەن، بە دڵنیاییەوە زۆر حەزدەکەم لە هەرێمی کوردستان کۆنسێرتێکی گەورە ساز

بکەم، ئەگەر سەرکەوتوو بوو ئەوا لە شارەکانی تر سازی بکەم، چونکە هەرێمی کوردستان هەنگاوی گەورەی لە بواری کولتووری و ئازادیدا ناوە، ئەمە جگە لەوەی هونەرمەندی مەزن و گۆرانیبێژ و مۆزیککاری بە توانای تێدایە، ئەمە پلانی کاری هونەریمە، بەڵام لە داهاتوودا هەنگاوی گەورەی بۆ دەنێم لەگەڵ دۆستان و خۆشەویستانمدا.

***با پرسیارێکت سەبارەت بە دەستپێکردنی کاری هونەریت لێ بکەم، بەچ گۆرانی و ئەلبوومێك هاتنە نێو کاری گۆرانی هونەرییەوە؟**

– زۆرجار ئەم پرسیارەم لێکراوە، بەڵام لەبەر ئەوەی خوێنەرانی ئێوە لە فەرەنسا جیاوازە لە خوێنەرانی وڵاتەکەی خۆم، هەوڵ دەدەم سەرەتایەکی پێویست لەسەر سەرەتاکانی کاری هونەریی خۆم بۆ خوێنەرەکانتان بخەمە ڕوو، باسی قۆناغی منداڵی و حەز و ئارەزووەکانم ناکەم، باسی ئەو کاتە دەکەم کەساڵی ١٩٨٥ بوو دوای ئەوەی بەرهەمەکانم برد بۆ کۆمپانیا گەورەکانی بواری بەرهەمهێنانی هونەرییەوە، زۆربەیان دەستیان نا بە ڕوومەوە، گوایە ئەم ستایلە ڕەواجی نابێت، کۆڵم نەدا بە هاوکاری دۆستەکانم یەکەم ئەلبوومی خۆم بە ناوی (مەگری کۆرپەکەم) بڵاوکردەوە، پاش چەند ڕۆژێک دەزگا تەناهییەکانی وڵات زۆربەی نوسخەی ئەلبوومەکەمیان لە بازاڕدا کۆکردەوە، هەرچەندە دواتر ئازادیان کرد، بەڵام پێشوازییەکی زۆرم لێکرا، بێگومان بۆ من سەرەتایەکی دڵخۆشکەر بوو، هەرچەندە دوایی دەرکردنی بەدوادا هات و تەنانەت بڕیاری زیندانیکردنیشم بۆ دەرچوو، گوایە گۆرانییەکانم هەستی دوو بەرەکی و نەژادی لە تورکیا دەجولێنێت.!



***هیچ پەیامێکی تایبەتیت هەیە بۆ وڵاتەکەی خۆت؟**

– یەک وشەم هەیە، ئەویش (ئازادی) ناکرێت وڵاتێک بەردەوام بێت لە زیندانیکردنی دەنگە ئازادەکانی وڵاتەکەی و هونەرمەند و نووسەر و ڕۆژنامەنووسەکانی ئاوارەی مەنفا بکات.

***بەقسەکانتا دەردەکەوێت حەزێکی زۆرت هەیە بۆ گەڕانەوە بۆ تورکیا؟**

– بێگومان وایە.

***ئامادەی بگەڕێیتەوە بۆ تورکیا و پابەند بیت بەو سیستەم و یاسایانەی کە دەوڵەت دایناوە؟**

– ئامادە نیم جارێکی تر لە ژێردەستەیی بژیم، ئەگەر گیانی خۆشم بەخشی بێت.

***ڕەخنەی ئەوەت لێدەگیرێت زۆربەی پەیامی گۆرانییەکانت سیاسی و وروژاندنی سۆزی گوێگرانتە، وەڵامت بۆ ئەم ڕەخنەیە چییە؟**

– ئەوە قسەی پۆلیس و دادگا و تورکە ڕەگەز پەرستەکانە، گۆرانییەکانی من جگە لە وتنی ئاوازی مرۆڤایەتی هیچی تر نەبوون، ناکرێت دەوڵەت لەوەشدا خۆی هەڵقورتێنێت کە چ جۆرە گۆرانییەک دەڵێین، ئاوازەکان چۆنن، چ شیعرێک هەڵدەبژێرین، ئەمە ترۆپکی نازییەت و دیکتاتۆرییە.

***وەڵامەکەت ئەوەی سەلماند بەو ڕەخنانە زویر دەبیت کە بەرگی سیاسی بە گۆرانییەکانت ببەخشرێت؟**

– من پێشتریش پێم وتی، من ئەندامی هیچ گروپێکی سیاسی نیم، بەڵام حەزم بە سەرکەوتنی نەتەوەکەمە، سەبارەت بە پەیامی سیاسی گۆرانییەکانیشم، ئەوەندە دەڵێم ئێمە کە چاومان هەڵهێنا هەستمان بە چەوساندنەوە و قەدەغەکردنی زمانی دایک و بێبەشکردنمان لە خوێندن کردووە، ئەم پرسانە خۆی بۆ خۆی پاڵت پێوە دەنێت بۆ ناو ئەو گەمەیەی پێی دەڵێین سیاسەت.

***دەڵێن پێش هەڵهاتنت لە تورکیا باڵوێزی فەرەنسا لە تورکیا تۆی بینیووە و پەیمانی ئەوەی پێداویت ڕەگەزنامەی وڵاتەکەیت بۆ وەردەگرێت؟**

– نەخێر شتی وا نییە، هاتنەکەشم بۆ پاریس بە ڕێکەوت بووە، دۆستان و خۆشەویستانم ڕۆڵیان بینی لە هاتنم بۆ فەرەنسا.

***لێرە هەست بە ئارام بوونەوە دەکەیت؟**

– وەک لایەنی ژیان و کاروباری هونەریی خۆم بەڵێ، بەڵام وەک لایەنی سایکۆلۆژی خەیاڵم هەر لای نیشتمانەکەی خۆمە.

***دوای ئەم چاوپێکەوتنە هەواڵی ئەوەت بدەنێ بە ئازادی بگەڕێیتەوە بۆ وڵاتەکەی خۆت و کار و بارەکانی خۆت بە ئازادی بکەیت و گۆرانی بە زمانی دایکت بڵێیت، هەست بە چی دەکەیت؟**

– خەوێکی خۆشە، نازانم دێتە دی یان ؟ باچاوەڕوان بین.!



# ئەحمەد کایا

## مرۆڤێکی چەوساوە، هونەرمەندێکی باڵا



د.هۆگر مەحموود فەرەج

ڕۆژێک لە ڕۆژانی ساڵی ١٩٥٧، دروست لە ٢٩/١٠دا، کۆرپەیەک لە شاری مەلاتییەی باکووری کوردستان، بە یەکەم قیژەی هاتنە ژیانی سەر زەوی خۆی، کەشی پڕ لە دڵەڕاوکێی ناو خێزانەکەی دەڕەوێنێتەوە. مژدەی زیندوویەتیی خۆی، بە گوێی دایکی تاساوی بەر زەبری ژانی هێنانە ژیانی جگەرگۆشەکەی، دەگەیێنێت. ئەو کۆرپە ژیکەڵەیە، ئەحمەد کایای کوردانی لێ دەرچوو. ئەحمەدی چاوگەش، بێ ئاگا لە باری ژیانی پڕ چەرمەسەریی نەتەوە و خێزانەکەی، ئازادانە بۆ ژیان دەتریقایەوە، ماڵی پڕکردبوو لە شنەشنی هیوا و تەزووی شادی و گوڕی چاو بڕینە دوا ڕۆژی ڕۆشنتر لەوەی کە تا ئەو دەمە گوزەرا بوو. ئەحمەد هەر لە ساوایەتییەوە گوێکانی بە سەرنجێکی قووڵەوە بۆ ئاواز و ترپە و دەنگی خۆش، ڕادەدێرا. ئەو لە شەش ساڵیدا بە دەستە خرپنە بچکۆلەکانی کەوتە کوتانی ئەو تەنەکە خاڵییەی لە ماڵەکەیاندا بوو. ئەو لە گەڵ کوتانی تەنەکەکەدا، چێژی ترپە گوێیەکانی ئاودەدا. تەنەکەکە بۆ ئەو ببووە تەپڵێکی ناوازە و لە کات و ناکاتدا دەیخستە نێوان ئەژنۆکانی، وایدەزانی بۆی دەبنە دوو باڵ و بە ئاسمانی ئاوازەکاندا دەفڕێت. ئەم خولیایەی ئەحمەد جێگەی سەرنجی باوکە حەسرەت دیدەکەی بوو، بەڵام چی دەکەیت لە دەست کورتی، کە ناهێڵێت وەک باوکانی تر بچێت وئامێرێکی مۆسیکی بۆ منداڵەکەی بکڕێت.

کاتێک ئەحمەد تەمەنی گەیشتە هەشت ساڵان، باوکە زەحمەتکێشەکەی قیروسیای لێکرد و چووە بازاڕ تەمبوورێکی هەرزانی بۆ جگەرگۆشەکەی کڕی. بە شادییەوە بەرەو ماڵ

بووەوە، هەر کە گەیشتە ماڵەوە و دایە دەست کوڕەکەی، بە جۆرێک لە جۆرەکان باوکە تاس بردییەوە، چونکە بینیی ئەحمەدی چاو گەش لە باتی قسە و پێکەنین، دایە پرمەی گریان. تومەز عەزرەتیەتی، ئەحمەدی کوڕیژکە و خەونی ئـەو بۆ دەستدانە تەمبوور، بووەتە هۆی تەقاندنەوەی ئەو قوڵپی گریانی خۆشییە. لێرەوە خەونێکی مۆسیککارە خۆڕسکە بچکۆلەکە هاتەدی. دیارە ئەمە بۆ خێزانێکی هەژاری بەشمەینەت، بەخششێکی کەم نییە. ئیتر تەنەکەکە وەلانرا و دەستە خرپنۆکەکانی ئەحمەد ئاوێزانی تەمبوورەکە بوون. تەنانەت زۆر جاران، کە هێزی خەو و خولیای مۆسیک لە مێشکی بچکۆلەی ئەحمەددا دەیانکردە زۆران، ئەگەر خەو زاڵبووبا، ئەوا ئەحمەد لەگەڵ تەمبوورەکەیدا لار دەبووەوە، بە شێوەیەک، کە دەبوو دایکی زۆر میهرەبانانە دەستەکانی لە تەمبوورەکەی بکاتەوە و لێی دوور بخاتەوە، دەنا بە ئاگا دەهاتەوە



و دەینایەوە کۆشی، ڕۆژان دێن و ڕادەبـوورن، کورد لە خاکی خۆیدا تا بێت تەنگی پێپەڵدەچنرێت، خێروبێری کوردستانەکەی بە تاڵان دەبرێت، خاکی بە سووتماک دەکرێت و خەڵکەکەی ناچاری ڕەو دەکرێن. جا ئەو ڕەوە بۆ وڵاتانی تر بێت یاخود بۆ شارە گەورەکانی ڕۆژئاوای تورکیا. لەوێ ناچاری پاڵەیی و ئەوکارانە دەکرێن، کە خەڵکی دی پێی ڕازی نابن. باوکی ئەحمەد یەکێک بوو لەو هەزاران سەرۆک خێزانانەی، کە ڕێگەی ئەستەمبوڵ دەگرێتە بەر. لەوێ مل دەداتە بەر ژیانی پڕ کوێرەوەری. ئەحمەدی منداڵ، کە بۆ یەکەم جار دەریا دەبینێت، ئاسمانی شینی بەرفراوان دەبینێت، ئەمانە بۆ ئەو دیمەنگەلێکی سەرنج ڕاکێش بوون، سەرسامیان دەکرد. دواتر وەک زۆرینەی هەرە زۆری خێزانە هەڵکەندراوەکانی نیشتمان، کولەمەرگیی ژیان وا دەخوازێت، کە سەرجەم ئەندامانیان لە پێناوی ژیاندا، لە هەر تەمەنێکدابن، بە شێوەیەک لە شێوەکان شان بدەنە بەر کارکردن. ئەحمەدیش هەروابوو، چەندان جۆر کاری کردووە. دواجار لە دوکانێکی کاسێت فرۆشیدا دەبێتە شاگرد. دوکانێکی لەو چەشنە بە جۆرێک لە جۆرەکان لە خولیای ئەوەوە نزیک بوو. هاوکات زۆربەی زۆری کڕیارەکانیشیان خوێندکارانی زانکۆ بوون، کچان و کوڕانی پۆشتە و پەرداخ، پڕ لە وزە و دەم بە پێکەنین. گەلێ جار ئەندێشەی ئەحمەد وەک پەپوولە بە دوایاندا دەکەوتە باڵ لێکدان. ئاوەزی بەرەو بـەراورد کردن لە نێوان ژیانی ئەمانی کورد و ئەوانی تورکدا، دەیبرد. ئەو پرسەی لا دروست دەبوو، کە نزیکەی سەدەیەک لەوەو بەر بە مێشکی مەلیکی کوردستان شێخ مەحموودی نەمردا هاتبوو. ئاخر ئەویش هەر لە تەمەنێکی منداڵیدا دەبێت، کە لە یەکەم سەفەری شێخ سەعیدی باوکیدا، کە سوڵتانی عوسمانی بانگهێشتی ئەستەنبوڵی دەکات، دەچێت و ئەو پایەتەختەی داگیرکەرانی کوردستان دەبینێت. جا شێخ مەحموودی منداڵ کە دەبینێت ئەستەمبوڵ خانوو و بەرەی جوانن و خەڵکەکەی پۆشتەن و جلوبەرگیان نایابن، ئەمانە دەیخەنە سەر کەڵکەڵەی پرسین لە باوکی، کە ئەرێ هۆی چییە شاری ئێمە وا وێرانەیە و خەڵکی ئێمە وا شڕۆڵ و بێچارەن و ئەم شارەش بەم شێوەیەیە؟. شێخ سەعیدی بەئاگاش، وەڵامێکی زۆر بەجێی لێزانانەی جگەرگۆشەکەی دەداتەوە و دەڵێت: کوڕەکەم ئێمە بۆ ئەمانە دەژین، بەڵام ئەمان بۆ خۆیان..!

هەرواشە، بەبێ هیچ گومانێک تا ئەو دەمەی کورد لە خاکی خۆیدا ئازاد نەبێت، ئەوا نەوە بە نەوە ئەگەر لەناو داگیرکەراندا نەتوێینەوە، ئەم پرسەمان لا دروست دەبێت. لەو ڕۆژگارەدا، کە ئەحمەد کایا شاگردی کاسێت فرۆش دەبێت، دوو لووزە و لەو وڵاتەدا لە گۆڕەپانی هونەردا لە تۆغیاندا بوون، کە ئەوانیش لووزەوی (ئورهان گینجەبای) و (ڕوهی سو) بوون. هەرچی گینجەبای بوو، بۆ سۆزداری و کوێرەوەرییەکان (گۆرانی دەچڕی). دووهەمیان بۆ نەتەوە و نیشتمان، گۆرانی دەگوت

ئەحمەد هەر زوو ئەوە سەرنجی ڕاکێشا، کە خواستی زۆری خوێندکارانی زانکۆی ئەودەمەی ئەستەمبووڵ بۆ کاسێتەکانی (ڕوهی سو)یە. ئەم سەرنجە پرسێکی بەجێی لا درووست دەکات، ئەویش ئەوە بوو ئەرێ هۆی چیبێت هەموو ئەم خوێندکارانەی زانکۆ، سەودا و عەوداڵی هونەری (روهی سو)ن. جا بۆ بەدەست هێنانی وەڵام، ئەحمەدی خوێن گەرم بڕیار دەدات بە وردی گوێ لە (روهی سو) بگرێت، تاوەکو لە ڕازی ئەو ئاپۆڕەی خوێندکارانەی خوازیاری دەنگ و هونەری (روهی سو)ن، بگات و هاوکات لێیشی تێبگات. ئەمەش وایکرد، کە دواتر لای خۆشەویست بێت و بەرە و دەستدانە موسیک و کاری ڕژد بیهەژێنێت و دنە دەریشبیێت. هەرواش کەوتەوە، چونکە بەرەبەرە توانای هونەریی کایا پەرەی دەسەند. دیارە هەروەکو وتمان، کایا خۆی کوردە و لە باوەشی دایکێکی کورددا، پەروەردە بووە. ئەمە خۆی لە خۆیدا بناغەی گۆشکراویی بە دەنگ و ئاواز بۆ ڕەخساندووە، چونکە لایلایەی دایکانی کورد، بە دەم قوم لێدانی شیری پاکەوە، منداڵانی کورد بەرەو خەوی ئارامی دەبات. لەو لاشەوە قوربانیدان هەر لە شیرەخۆرییەوە بە گوێی ڕۆڵەکانی کورددا دەدرێت، ئەی ئەوە نییە دایکانی کورد هەمیشە بە جگەرگۆشەکانیان دەڵێن: مەرگم پێش مەرگت بکەوێت. هەر ئەو وتراوەی دایکانی کوردیش بوو وای لە شاعیری گەورە (نیزامیی گەنجەوی)کردووە بڵێت دایکم دایکسیفەتانە بەر لە من مردووە .دیارە ئەو قسەیەی ئەو بە دوای ئەوەدایە، کە خۆی وتوویەتی: دایکم سەرۆکی کـوردان بـووە، من کە ئـەم نموونەیە و ئـەم قسەیەی گەنجەویش بیر دەخەمەوە، دیارە بێ مەبەست نیم، بەڵکو مەبەستمە بڵێم تەنانەت ئەو شاعیرە گەورەیەشمان، ئەگەر بە زمانی کوردی بشیعرایە، ئەوا نەدەبوو، کە بە هۆی زمانەوە خەڵکی تر بە موڵکی خۆیانی بزانن. دیارە ئەوانە

زۆریش ناڕەوا نین، چونکە زمان ناسنامەی نەتەوەیە، جا لە کوێ زمان لە دەستدرا لەو جێگەیە نەتەوەکەش لە دەست چووە. هەر نەبێت زادەی هزر و دەست و هونەری دەچێتە ڕاژەی زمان و هونەری نەتەوەی دیکەوە. بۆیە ئەگەر نیزامی نەیگوتایە دایکم سـەرداری کوردان بووە، ئێستا بە چیدا قسەمان لە کوردبوونی ئەو بکردایە، هەر بەو پێودانگەش ئەحمەد کایاشمان ئەگەر لە ئاهەنگەکەی ١٠/ شوباتی ١٩٩٩ی شۆتێڤێدا، کە بۆ ڕاگەیاندنی خەڵاتی هونەرمەندی ساڵ، بۆ کایا ساز کرا بوو، خۆی لە بەردەم ئەو خەڵکە و هەموو ئەو کامێرایانەدا نەیگوتایە من کوردم و بە نیازم بە زمانی زگماکیشم گۆرانی بچڕم، ئەوا ئێستا تا یەکێک دەیگوت کایا کورد بوو، سەدان دەیانگوت ئەو نەک هەر کورد نییە، بەڵکو بگرە بە ڕەچەڵەک و خزمانی ئەتاتورکیشە. ئاخر ئەو ڕاگەیاندنەی کایا هەڵوێستێکی زۆر پاڵەوانانە بوو، چونکە ئەو زۆرچاک لە ترسناکیی ئەو هەڵوێستە بۆ ژیان و بەرژەوەندییەکانی بە ئاگا بوو، بەڵام هـەروەک چۆن پێشمەرگە لەو لایەنانە بێباکە، کایاش پێشمەرگەی بواری هونەر بوو. کێ دەتوانێت گومان لەم ڕاستییە بکات؟ ئەی کایا نەیگوتووە ویستوومە بە زمانی تورکی بە سەر پەیژەی هونەردا سەربکەوم و لە سەر دوا پلەوە کوردبوونم ڕابگەێنم و ڕاژەی هونەری کوردی بکەم؟. دیارە هەر واشیکرد.

کایا هەر لەو ڕۆژگـارەوە، کە شاگردی دوکانی کاسێت فرۆشییەکە بوو، چاک لە چەژەی چینی لاوانی ئەو وڵاتە بە ئاگا بووم هەر ئەوەش وایکرد ڕێچکەی (روهی سو) بگرێت. واتە گۆرانی بۆ نەتەوە و نیشتمان بڵێت، بەڵام وەک وتراوە هەرکەس بۆ لەیلیی خۆی دەگری. واتە وشەکانی نەتەوە و نیشتمان بە پێی کەسەکان واتایان دەگۆڕدرێت

بە واتایەکی تر کـورد، کە نەتەوەی خۆی و نیشتمانی خۆیشی هەیە و خەڵکانی تریش هـەر بـەو چەشنە، لێرەشەوەیە، کە لە یەکەم کاری هونەریی کایادا، کە بە ناونیشانی (ڕۆڵەکەم مەگری) دەخرێتە بـازاڕەوە و پێشکەشی دایکی دەکات، دەنگدانەوەیەکی وای دەبێت، کە کایا دووجار سەرسام دەکات. یەکەمیان لەبەر ئەوەی کایا وای دەزانی، کە بە بڵاوبوونەوەی ئەو کاسێتە، ئەم لە زیندان توند دەکرێت. دووهەمیان لەبەر ئەوەی، کە نەک هەرنەشگیرا، بەڵکو بەو کارە بووە خاوەنی ناوبانگێکی زۆر و تەنانەت بووە خۆشەویستی جەماوەریش. لێرەدا پێویستە

ئەوە بڵێین، کە ئەم نەگرتن و خۆشویستنە لەوەوەیە، کە تا ئەودەمە ڕەگەزپەرستان وەک تورک بۆیان ڕوانییوە و نەتەوە و نیشتمانەکەش لایان تورکان و تورکیا بووە. دەنا هـەرزوو بۆچوونەکانی کایا دەهاتنە دی، چونکە ئەو ڕۆژەی کاسێتەکە بڵاوبووەوە کایا لە ماڵ نەهاتە دەرەوە و لە چاوەڕوانی ئەوەدا بوو هەڵبکوتنە سەریان و ڕاپێچی بەندیخانەی بکەن، هەرخۆیشی لە لایەکەوە بەندیخانەی وا دەبینی، کە شوێنێک بێت بتوانێت بە ئارامی و دوور لە گوشارە ئابوورییەکان تێیدا ئۆقرە بگرێت. بۆ ئێوارەی ڕۆژی دواتر بە دڵەڕاوکێوە لە ماڵ هاتە دەر، لە یەکێک لە شەقامەکاندا هاوڕێیەکی خۆی دەبینێت، هەرزوو هاوڕێکەی بە سەرسامییەوە پیرۆزبایی ئەو گۆرانییە خۆشانەی لێدەکات، ئەمیش لە وەڵامدا، دەڵێت: لە چاوەڕوانی زیندانی کردندام، هاوڕێکەی پێی دەڵێت، کە ئەو گۆرانییە نیشتمانی و مرۆییانەت، هەستی مرۆیی تورکانی بزواندووە و هەرئەمەش خۆشەویستی هەموان و ناوبانگی بۆ مسۆگەر کردووە. هەر واشبوو، چونکە خوازیارانی دەنگ و هونەری کایا بە جۆرێک بوون، کە فرۆشی ئەو یەکەم کاسێتەی گەیشتە نیو ملیۆن دانە. کایا تا ئەو ساتەش هەر بڕوای بەوە نەدەکرد، کە دەیبیست، بەڵکو هەر چاوەڕێی پۆلیس بوو، بە پێچەوانەی بۆچوونەکەی کایاوە، لە ڤێستیڤاڵی هونەری تورکیادا، خەڵاتی دەستگای ڕۆژنامەگەریی تورکیای بەدەست هێنا. ئەو ڤێستیڤاڵەی، کە زۆرێک لە هونەرمەندان و ڕۆشنبیرانی تورک و جیهانییش تێیدا ئامادە بوون. هەر لەو ڤێستیڤاڵەدا لەکایایان پرسی سەبارەت بە پرۆژەی داهاتووی، ئەویش زۆر بە بڕوا خۆبوونەوە گوزارشتی لەوە کرد، کە بە نیازە بە زمانی زگماکی خۆی، کە کوردییە گۆرانی بچڕێت. ئەو دەربڕینی نیازە، بە جۆرێک ڕەگەز پەرستە توندڕەوەکانی بەلەسەکرد، کە هەرچی کەوچک و چەقۆ و چەتاڵ و دەفری خواردن هەبوو، بەسەریاندا باراند، هەرچی قسەی سارد و ناشیرینە پێیدرا. دوو کەسیش لەو بە ناو هونەرمەندانەی تورک، شەکری خۆیان شکاند و گوتیان: کەس ناتوانێت لە ژێر ئاڵای دەوڵەتی تورکیادا بڵێت من تورک نیم، تورکیاش تەنیا بۆ تورکانە. لەوێدا کایا هاتە قسە و گوتی: وامدەزانی سەبارەت بەو پرۆژەیەم ڕێزم لێدەگیرێت، من کوردم و مافی خۆمە بە زمانی خۆم گۆرانی بڵێم، ئەو ڕوداوە لە ١٠ ی شوباتی ١٩٩٩ دا بوو، هەر دەمودەست ئەوەشیان دایە پاڵ گوایە گوتوویەتی ئەو پشتگیریی ئۆجەلان دەکات. ئەمە لە کاتێکدا بوو، کە خودی ئۆجەلان لەو ڕۆژانەدا کەوتبووە بەر شەپۆلانی پەرژەوەندیی زلهێزان و بستە خاکێکی لەو هەموو دەوڵەتە بەناو دیموکراسییەدا پێ ڕەوا نەدەبینرا، کە پەنای بدات.

ئەوە بوو دواتر لە ١٥ی شوباتدا کایا ڕاپێچ کرا، بۆ ئـەوەی شەش مانگ زیندانی بکرێت، بـەڵام بە هۆی ئەوەوە، کە پێشتر گرێبەستی ئاهەنگێکی واژۆ کردبوو، کە بڕیاربوو لە فەرەنسا ساز بکرێت. بۆیە دەسەڵاتدارانی تورک ناچار بوون ڕێگەی بدەن بچێتە فەرەنسا، بەڵام بە پاسەوانییەکی توندی پیاوانی ئاسایشی تورکیاوە، تاوەکو ڕاستەوخۆ دوای ئاهەنگەکە بگەڕێنرێتەوە. خۆشبەختانە کایا توانی خۆی لە پاسەوانەکان ون بکات و لەو وڵاتەدا مافی مانەوە بەدەست بهێنێت. کایا لە حوزەیرانی ١٩٩٩وە، لە هەندەران جێگیر بوو. دواتر لە ٢٠٠٠/١١/١٦دا، بۆ دواجار چاوەکانی لێکنا، بەڵام خۆشبەختانە لە پێش کۆچی ناوادەیدا، ئاواتە گەورەکەی خۆی بەدی هێنا، کە ئەویش لە چڕینی گۆرانی بە زمانی زگماکی خۆی، خۆی دەبینییەوە.

ئێستا پرسێک خۆ دەسەپێنێت، ئەویش ئەوەیە: ئەرێ هۆی چی بێت داگیرکەرانی کورد و کوردستانەکەمان هێندە لە کورد بوونمان دەترسن؟!. دیارە وەڵامەکە ڕوون و ئاشکرایە، ئەویش ئەوەیە کە مانەوەی ئێمە وەک کورد، بە هەڕەشە بۆ مانی خۆیان و دەسەڵات و زمان و هونەر و... هتد.. خۆیان دەزانن، چونکە داگیرکەران تەنیا مرۆڤەکانیان ئەنفال نەکردووین، هەر وەک چۆن ئەنفالیش تەنیا ئەوە نەبوو، کە لە هەشتاکانی سەدەی پێشوودا ڕژێمەکەی سەدام کردی، بەڵکو مێژوومان پڕە لە ئەنفال. جا ئەنفالیش بە هەموو جۆرەکانیەوەیە. ئەنفالی زمان، ئەنفالی هونەر، ئەنفالی کەلتوور، ئەنفالی دەستنووس، ئەنفالی ئایین...تاد.

ئاخر ئەگەر ئەمە ڕاست نییە، ئەی دەبێت هۆی چی بێت، کە مێژووی هونەری نیگارکێشیی لای تورک بۆ پێنجسەد ساڵ بگێڕدرێتەوە و بە کتێبیش بخرێتە کتێبخانەی وڵاتانەوە، کەچی یەکەم تابلۆی ئەو مێژووەیان، تابلۆی هونەرمەندێکە سەبارەت بە ئیسرا و میعراج، بەڵام خۆشبەختانە هونەرمەندەکە لە تابلۆکەیدا کورد بوونی



خۆی تۆمارکردووە، کەچی کتێبە زەردەکە بە سەرەتای مێژووی هونەری نیگارکێشی تورکی لە قەڵەم داوە. خۆ ئەگەر تەنیا لە ناوی گوند و شارۆچکە و شارەکانمان بڕوانین، کە تورک و عەرەب و...تاد، گۆڕیویانن، ئەوا دەیان هەزار ناوی کوردانەیان تورکاندووین، یاخود عەرەبێنراون، یان بە ناوی ئیسلامەوە عەرەباندوویانن. دیارە ئەمە خۆی بۆخۆی فەرهەنگێکی دەوێت. بڵێی ئەوە ئەنفالی فەرهەنگ و زمان و جوگرافیاش نەبێت. ئەی ئەوەی کە مەلایەکی زانای وەک (ئیبنو ئادەم) مان بە شیعر تۆماری کردووە، بڵێی ئەنفالی دەستنووس و کتێبخانان نەبێت؟! لەوەدا کە پتر لە دووسەدە ئیبنو ئادەم، دەڵێت:

هەوران کردییە گۆڵە گۆڵا
میکائیلا ئەتۆش دەی
توتن و ماشان بڕشێنە
دەبا نۆش بێتە سەردەی
ڕۆمی ئەوا پەیدا بوون
کوتووبخانان دەکەن تەی

دیارە وشەی (ڕۆمی) لە ئەدەبییاتی کلاسیکی کورددا، بە واتای تورک هاتووە. ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە مێژووی کۆنی کورد، کە پڕبووە لە ململانێ لە کۆندا لەگەڵ ڕۆمەکاندا، بەڵام دوای ئەوەی کە تیرە تورکەکان ئەو ناوچانە داگیر دەکەن، ئەم وشەی (ڕۆم)ە بۆ ئەمانیش بە کار دەهات. جا ئیبنو ئادەم زۆر بەڕاشکاوی باسی پەلاماردانی تورک دەکات، کە چۆن هەرچی دەستنووس و کتێبێک بەر دەستیان کەوتبێت، ئەگەر لە ناویان نەبردبێت، ئەوا پێچاویانەتەوە و بردراوە. جا ئەگەر سەرنجێک لە لایەنی دەنگ و ئاواز و هونەری مۆسیکیش بدەین، ئەوا بە ئاشکرا ئەوە دەر دەکەوێت، کە نەک هەر تەنیا ئاوازە کوردییەکان ئەنفالکراون، بەڵکو دەست و پەنجە و گەرووە کوردەکانیش ئەنفالکراون. خۆ ئەگەر ئەوەیان نەکردبێت، ئەوا لە ناوبراون، چونکە چاک ئەوەیان زانیوە کە دەنگ و ئاواز و لایلایەی دایکان، پارێزگاری لە مانەوەی زمانی زگماک و میزاجی کوردەواری دەکەن. خۆ ئەگەر سەرنجێک لە ئاسەوارە دێرینەکانی کوردستانیش بدەین، ئەوا لەو لایەنانەی تر هەلومەرجیان باشتر نەبووە، ئەگەر خراپتریش نەبووبێت. هەر بۆنموونە هەرچی ئاسەوارێک ئەگەر بە ڕاشکاوی پەیوەندی بە کوردەوە هەبوو بێت، ئەوا لە ناو براوە، یاخود لە بەرچاو گومکراوە. چاکترین بەڵگەش ئەوەیە، کە لە کاتی خۆیدا زانای ئاسەوارناسیی عێراقی تەها باقر، وتوویەتی: گەیشتوومەتە هەندێک ڕاستی، کە ناتوانین لە بارەیانەوە بدوێین. لە بیریشمان نەچێت تەها باقر ئەو کەسایەتییەیە، کە حەرەس قەومییەکانی بەعس لە ١٩٦٣دا گرتیان و سووکایەتییانپێکرد.

خانیی مەزن، چەند سەدەیەک لەمەو بەر، دەڵێت: ئەگەر ئێمە یەکگرتوو بین و یەک پێشەنگمان هەبێت، ئەوا زمانیشمان ڕەواجی دەبێت. دیارە ئەم ڕەواجەش لەو کاتەدا دەبێت، کە خۆیشمان بە کەم نەزانین. جا ئەگەر سەرنج لەم هەرێمەی خۆمان بدەین، ئەوا دەبینین کە ڕێژەی خوێندن بە زمانانی تر لە گەشە کردندایە و لە ناویشیاندا بە زمانی تورکی هەن. سەیر ئەوەیە ئەم قوتابخانە تورکییانە سەر بە (فەتحوڵڵا گوڵەن)ن، کە هەر ئەمڕۆ ئەردۆغان ئەو ڕاستییەی بۆ تورکیش خستە ڕوو، کە ئەو قوتابخانانە بە زیانی خێزانەکان دەکەوێتەوە. بۆیە بە ئاشکرا داوای ئەوە لە تورکان دەکات، کە منداڵانیان نەنێرنە بەر خوێندن لەو خوێندنگایانەدا. جا ئەگەر ئەردۆغان ئەو ڕاستییەی دەرک پێکردبێت، ئەی ئێمەی کورد چۆنی لێک بدەینەوە؟!!.





ئەرێ دەبێت ئەو بەڕێزانە لەپاڵ بەرنامەی خوێندنیاندا، چ ژارێک بتکێننە ئاوەزی منداڵانمانەوە؟!. گومانم لەوە نییە، کە ئەمەش ئەنفالە، بەڵام ئەنفالی هۆش و ئاوەز.

دەگەڕێمەوە لای گیانی کایا، ئەو هونەرمەندەی کە بە لاشە بەجێی هێشتین، گەرچی من گومانم لە مردنەکەشی هەیە، لەوەدا کە ئەرێ بڵێی مردنێکی ئاسایی بووبێت؟!، چونکە پێموایە، کە مردنەکە لەو چەشنەیە کە سەرۆک ئۆزالی هاوشاری کایای پێ لەسەر شانۆی ڕامیاری وەلانرا. نەک هەرئەوە، بەڵکو گومانم لە مەرگی یەڵماز گۆنایش هەیە، ئەو هونەرمەندە سینەماکارەی، کە ئێستا لە گۆڕستانی مەزنان لەگەڵ کایای گۆڕغەریبدایە. سەیر ئەوەیە، کە داگیرکەران لەوەش دەترسان، کە کوردان سەردانی ئەو گۆڕغەریبانەمان بکەن. چۆن وانییە؟!، ئەی ئەوە نەبوو کاتێک کە هونەرمەند مەعسووم قرمزگوڵ و فەرهاد تونج، سەردانی گۆڕەکەیان کرد، کەچی دەسەڵاتدارانی تورک لێپێچینەوەیان لەگەڵدا کردن!!. ئاخر لەکام گۆشەی ئەم جیهانەدا کاری وا کراوە؟!. ئەوەی گومان لەم گومانە دەکات، با بڕوات لە مێژووی پڕ لە غەدری داگیرکەران بەرامبەر بە کورد و ناودارانی سەرنج بدات. خۆزگەش دەخوازم ڕۆژێک بێت پرووزک (روفات)ی ئەو هونەرمەندانەمان ببرێنە تاقیگە، تاوەکو لەوە دڵنیا بین، کە مردنیان مردنی ئاسایی بووە.

ئێستا کایای هونەرمەند لە بەهەشتی نەمریدایە، تورکیاش هێندێک تیشکی تێدا دەبینرێت، کە هیوایەکی شەرمنانە سەبارەت بە داهاتووی کورد لەو وڵاتەدا ببەخشن، ئەگەر ئەمەش هەر خۆڵکردنە چاو نەبێت!. هەر بۆ نموونە دوای (١٣) ساڵ لە کۆچی ناوادەی کایا، کۆمەڵەی ڕۆژنامەوانانی تورکیا، داوای لێبووردنیان لە گیانی کایا کرد. هەر لە ساڵی پاردا، لە ٢٠١٣/١٠/٢٩دا، کە ڕۆژی لە دایکبوونی کایا بوو، عەبدوڵڵا گوڵ، خەڵاتی ڕۆشنبیری و هونەریی سەرۆکایەتیی باڵای بە کایا بەخشی. لەم دواییانەشدا (ئیگمان باگیش)ی وەزیری ڕێپێدراوی تورک لە یەکێتیی ئەورووپا، چووە سەر گۆڕی کایا و فاتیحەی دادا و وتی: کایا خەونی بە تورکیایەکی دیموکراسییەوە دەبینی، وا ئێستا خەونەکەی هاتووەتە دی، بەڵام ئەو نەیبینی. هاوکات کایا لە دیارترین هونەرمەندانی موسیککاری سەدەی بیست بوو.

دیارە ئەم قسانە لە زمانی کەسانی سەر بە دەسەڵاتی تورکیاوە، بۆ گوێی ئێمەی کورد نامۆ و نوێن. بۆیە هیوادارین لە ویژدانێکی زیندوو و پاکەوە بن، تاوەکو ببێتە سەرەتای کۆتایی نەهامەتییەکانی گەلانی تورکیا و سەرجەم گەلانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست. بەندەش لەم شارەی شێخی نەمرەوە، سەری ڕێز و نەوازش بۆ سەرجەم ئەو هونەرمەندانە دادەنەوێنم، کە هونەریان لە پێناو نەتەوەدا بووە و هەیە. هاوکات بە خانم (گوڵتان کایا) ش دەڵێم: ئەگەر هاوسەرەکەت لە دیارترین هونەرمەندان بووبێت، ئەوا تۆی هاوسەر و خۆشەویستی کایاش، لە خۆشەویستترین و بەڕێزترین و خانمانن بۆ نەتەوەی کورد. ئەوانیش گیانیان شاد.





# دیوارەکان نایەنەگۆ

دایکم پرسی: ئەحمەد خۆ تۆ تەمەنت سی و پێنج ساڵ زیاتر نییە، بۆچی ریشت هەموو سپی بووە؟
پێمگوت: دایکە، جا خۆ ئەم بێشەرەفانە ریشی مردوەکانیش سپی دەکەن.

ئەحمەد کایا – کۆنسێرتی ئیستانبوڵ

و: ئارام رەشید



ئەحمەد کایا، لە ساڵی ١٩٨٥ بڕیاری بڵاوکردنەوەی ئەلبوومێک لە کارەکانی ئەدات و رووداوەکاتە شەقامی «ئون کاپی» (شەقامێکی هونەریی ئیستانبوڵ) بەڵام لەبەرئەوەی ستایل و موزیکی ئەو لە قاڵبی هیچ کام لە ستایلەکانی ئەوکاتەی تورکیادا جێی نابێتەوە، کەس ئامادە نابێت ئەلبوومەکەی بەرهەم بهێنێت. بۆیە دواجار بە کۆمەکی چەند هاوڕێیەکی یەکەمین ئەلبوومی خۆی تۆمارو بڵاو دەکاتەوە. ئەم ئەلبوومە بە خێرایی لە لایەن دەسەڵاتەوە رادەگیرێت و سەرجەم نوسخەکانی کۆدەکرێتەوە. بەرهەڵستییە پەیتا پەیتاکانی ئەحمەد کایا دەرەنجامی دەبێت و کار دەگاتە رۆژنامە و گۆڤارەکان و دادگا بڕیاری هەڵگرتنی بڕیاری راگیرانی ئەلبوومەکە دەردەکات. پێشوازی هێجگار باشی خەڵکی لەم ئەلبوومە، کایا لەو رێگایەی گرتوویەتیە بەر، مکووڕ ترو دڵ گەرمتر دەکات و زیاتر هانی دەدات.

پاش ئەو بەروارە، کایا دەبێتە دەنگی چینی خوارەوەی کۆمەڵگە و کوردە مافخوراوەکانی وڵاتی تورکیا. ئەحمەد کایا گۆرانی گوتن وەک چەکێک بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی نادادپەروەردەییە کۆمەڵایەتییەکان و شەڕی کوردان و دەسەڵاتی چەوسێنەری وڵاتەکەی بە کاردێنێت و چەندین و چەندان جار زیندانیکردن و ڕاگرتنی ئەلبوومەکانی و کەنسڵکردنەوەی کۆنسێرتەکانی تەحەمول دەکات. ئەو کۆنسێرتانەی کە جاروبار مۆڵەتی پێشکەشکردنیان وەردەگرێت و لەسەرانسەری وڵاتدا رووبەڕووی پێشوازییەکی گەلێک زۆر دەبێتەوە. کایا هەمیشە بە پێخاوس لەسەر شانۆی کۆنسێرتەکانی دەردەکەوێتو پەنجەکانی بە دروشمی سەرکەوتن بەرز ڕادەگرێت.

کایا ستایلی جیاواز جیاواز تاقی دەکاتەوە لە بواری مۆزیکدا و هەر لە مۆسیقای میللییەوە تاوەکو راپ و رۆک. بێجگە لە هۆنراوەکانی خۆی، کایا لە هۆنراوەکانی شاعیران و هەڵبەستەوانانی بەناوبانگی تورک زمانانی وەک: نازم حیکمەت، ئۆرهان وەلی، ئەحمەد عارف، ئەنوەر گوکچە، حەسەن حسێنی گیل، نوزار چلیک، ئاتیلا ئیلهان، ئولکوتامیر، یوسف هایال ئۆغڵو، جان یوجل، غەلی چینار، ئۆرهان ئاکوتان و هاوسەرەکەی «گوڵتەن هایال ئۆغڵو». کەڵک وەردەگرێت.

کایا ئەلبوومەکانی دەچنە ریزبەندی پڕفرۆشتنی ئەلبوومەکانی ساڵ و هەر گۆرانییەک پێشکەشی دەکات، دەبێتە کارەساتێک بۆی و لە دادگاوە سکاڵای لەسەر تۆمار دەکرێت. وەک خۆی دەیگوت ناونیشانی دووەمی نیشتەجێبوونی (فەرمانگەی زانیاری و ئاسایشی تورکیا) یە.

کایا وێڕای سەرجەم ئەم فشارانە، تا لەژیاندابوو پتر لە شانزە ئەلبووم بە ناوەکانی (یاخی دەبم. ناو: خۆشبەخت. تووشی دەردیسەرم. گۆرانی بەیانی. دیواری عیشق. دیموکراتی ماندوو. کاتێک دێت. گۆرانییەکانم بۆ کێوەکان. دەستی لێ مەدە، دەسوتێی. لەبەردەم دۆست و دوژمن لێمبدە و...) بڵاودەکاتەوە و هۆنراوە و ئاواز بۆ زۆرێک لە گۆرانیبێژانی تورک دادەنێت.

حکومەتی تورکیا وردە وردە ناچاردەبێت حزوری دەست هەڵنەگرێکی ئازاردەر بە ناوی ئەحمەد کایا قبووڵ بکات و گۆرانییە گەزندە و دژە ناحەقییەکانی تەحەمول بکات.

بە ئامادەبوونی کایا لەهەر بەرنامەیەکی تەلەفزیۆنیدا ئاماری تەماشاکەرانی ئەو بەرنامەیە بە شێوازێکی سەرسامکەر بەرز دەبێتەوە و چاوپێکەوتنی لەگەڵ هەر رۆژنامەیەک، فرۆشی ئەو رۆژنامەیە دەستەبەر دەکات.

کایا بە پیتی یەکەمی ناوی خۆی و هاوسەرەکەی کۆمپانیایەکی بەرهەمهێنانی گۆرانی بەناوی (G. A. K) دادەمەزرێنێت



و دەرگای ئەو کۆمپانیایە بەڕووی بەرهەمی هونەرمەندە تازەکارەکاندا دەکاتەوە.
ئەحمەد کایا لە سەرانسەری دونیادا دەست دەکات بە سازدانی کۆنسێرت و هەمیشە لەسەر ئامانجە یەکەمەکانی خۆی دەمێنێتەوە و لەم ساڵانەشدا چەندین خەڵات لە فێستیڤاڵە جیاوازەکانی ناوخۆ و دەرەوەی وڵات وەردەگرێت.
چەندین جاریش لەسەر پرسی گۆرانی گوتن ڕاپێچی دادگا دەکرێت، تەنانەت جارێک لە دادگا کە بە شێوازی پەخشی ڕاستەوخۆ لە چەند تەلەفزیۆنەوە پەخش دەبوو، ئامادە دەبێت و خەڵکی تورکیا گوێیان لە بەرگرینامە دوور و درێژەکەی دەبێت. ئەو ئەمجارە گۆرانی ناچڕێت، بەڵام وشەکانی بەرگرینامەکەی بە شەپۆلانی ئۆقیانوسێک دەچن، کە هەندێجار ئارامن و هەندێجار هەڵدەکشێن و تاشەبەردەکان پێکدا دەکێشن. هەموان شایەتحاڵ و بینەری بەهێزیی و پتەویی قسەکانی ئەون، خزمان و هاوڕێیان و هەواداران و ڕۆژنامەنووسانی سەرجەم میدیاکان و ئەو کەسانەی دەبێت دەربارەی ئەو داوەری بکەن.

## چەند بەشێك لەم بەرگرینامەیە بەم جۆرەیە:

(من لەسەر تیغی چەقۆیەک ڕاوەستاوم! کەسێک کە لە پێناو میلەتەکەیدا دەجەنگێت. ئەم بەرگرینامەیە لە یاد مەکەن... لە ساڵی ١٩٨٥وە مۆسیقارێکی پرۆفیشناڵ بووم. زەماوەندم کردووە و دوو کچی حەڤدە و دوانزە ساڵانم هەن. سەدان هۆنراوەم کردووە بە گۆرانی و لەسەر گەلێک لە ئاوازی گۆرانیبێژانی دیکە هۆنراوەم نووسیوە. حەڤدە ئەلبوومم بڵاوکردووەتەوە کە بە ملیۆنان نوسخەیان لێ کۆپی کراوە و فرۆشراون. چەندین کۆنسێرتم لە سەرانسەری دونیادا سازکردووە و چەندانجار وەک گۆرانیبێژی ساڵ لە لایەن دەزگا جیاوازەکانەوە هەڵبژێردراوم.
تەمەنم چل و دوو ساڵە و دانیشتووی وڵاتی تورکیام. بە تورکی بیرم کردۆتەوە، بە تورکی هۆنراوەم نووسیوە، بە تورکی خوێندومە. من مۆسیقارێکم و هاووڵاتییەکی ئەم جیهانە کە خۆی سەر بە هیچ بەشێکی جوگرافی نازانێت و هەستەکانی ڕوو دەکاتە هەموو مرۆڤێک، نەوەک گروپ و هۆزێکی تایبەت. دڵم بەڕادەیەک گەورەیە کە میوانداریی باشییەکانی سەرجەم زمانەکان و کەلتوورەکان و بیر و باوەڕەکان و گۆرانییەکی جیهان دەکات.
تۆمەتێکیان پێوە لکاندووم، سەراپای ژیانی ژێرەوژوور کردووم. تۆمەتی خیانەت. منیان بە کەسێکی ئاژاوەگێڕ، غوڵامێکی گوێ لە مشت، بنیادەمێکی بێ ئەدەب و بێ ئەقڵ، کەسێکی شێت و لیبۆکێک ناو بردووە. ئەم خەسڵەتانە تاقمێک کەسی ناسراو داویانەتە پاڵم. بۆچوون و قسەکانی مرۆڤێک، کە بنەمای سەرجەم ئەم تۆمەتبارکردنانەن لە هیچ وڵاتێکی شارستانی و یاسامەنددا بە تاوان و تۆمەت لە قەڵەم نادرێت.
من لە ئەلبومە تازەکەمدا گۆرانییەکی کوردیم گوتووە، بەس بەم هۆکارە سادەیەی کە کوردێکم. ڤیدیۆکلیپێکم بۆ ئەم گۆرانیەش ئامادە کردووە. باوەڕم وایە کەسانێک لە نێو ئێمەدا هەن، بوێری پەخشکردنی ئەو گۆرانییەیان لە کەناڵەکانی خۆیانەوە هەبێت. گەر وانەکەن دەبێت لە (کورد) بوون و (مرۆڤ) بوونیشیان گومان بکرێت. ئایا ئەو کەسانەی بە خاین و ئاژاوەگێڕو دوژمـن زانینی من، هەستی هەوادارنم بریندار دەکەن و دەبنە هۆی جیا بوونەوەی چین و توێژەکان، کەمینە نین؟ ئەو ملیۆنان کەسانەی گوێ بۆ قسەکانی من ڕائەدێرن، لە ڕیزی مرۆڤاندا نین، لە ڕیزی خەڵکی ئەم وڵاتەدا نین؟
من لەو هۆڵەدا بە بیستنی (خاین، برۆ دەرەوە) تـووڕە بـووم، چونکە ئەم ڕستەیەم لە زاری کەسانێکەوە بەرگوێ کەوت، هەر لە گەڵ وشەی (کورد) دەبیستن، جوێن ئەدەن. هەر لێرەوە بەوان دەڵێم کۆڵ نادەم تاوەکو ئەوان واقیعیەتی بوونی کوردەکان قبووڵ بکەن. بە بـڕوای من


کایا لەکاتی بردنی بۆ بەردەم دادگا

کتومت هەمان ئەو کەسانە بوون کە دەستەواژەی (برایەتی) یان خستە ژێر پێ و بوونە هۆی درووستبوونی درز لە نێوان کەلتووری هاوبەشی وڵاتەکەماندا. گەورەترین چەکی دەستی گۆرانیبێژێک گۆرانییەکەیەتی، منیش ڕێگە نادەم گۆرانییەکانم بەم جۆرە شرۆڤە بکەن و مانای دیکەیان پێ ببەخشن.
تەسەور بکەن من رامبگەیاندایە گۆرانییەک بە زمانی ئیتالی، یاخۆ عەرەبی و ئینگلیزی دەڵێم، ئایا ئەوکاتیش جەنجاڵییەکی وایان بەرپێدەخست؟
من هەمیشە گۆرانی کۆمەڵایەتیم گوتووە و لەسەر هەر شتێک لە وڵاتەکەمدا رووی داوە و دەلالەتی لە (خراپە) کردووە، بە ئاشکرا بەرهەڵستیم کردووە. هەرکاتێکیش گەشە و پەرەسەندنێکم بینیبێت لەو رووەوە بۆچوونی خۆم راگەیاندووە. گۆرانییەکانیشم هەر ئەمانەیان لە خۆیاندا هەڵگرتووە.
ئەم تۆمەت و سکاڵانامانە بە بڕوای من هەوڵی کۆمەڵێک لە کەناڵەکانی تەلەفزیۆن بوو، بۆ پەیداکردنی شتێک لە قسەکانی مندا، تاوەکو درامای لەسەر درووست بکەن. گەر من لە سەرجەم کۆنسێرتە چەند هەزار کەسییەکانمدا شتێکم گوتبایە ببوایەتە هۆی دووبەرەکی نانەوە لە نێوان خەڵکیدا، دەمتوانی قبووڵی بکەم ئەم تۆمەتانەش راستن... بەڵام وانییە. گەر بەزەینێکی روون و دادپەروەرانەوە بە وردی لە ڤیدیۆی ریکۆردکراوی بەرنامەی ئەو شەوە بڕوانرێت و شرۆڤەی بۆ بکرێت، دەبینین لە دژی من پیلانێک رێکخراوە.
بیری لێ بکەنەوە گۆرانیبێژێک لە هەر شوێنێکی دونیا رایبگەیاندایە لە ئێستا بەدوا بە ستایلی بلوز یاخود جاز گۆرانی دەڵێت، ئایا لەم قسەیە هەڵهێنجان دەکرا کە ئەو خەڵکی هان داوە؟ مۆسیقا زمانێکی جیهانییە و هیچ گۆرانییەکی دونیا ناتوانێت خەڵکانی هەموو جیهان جودا یاخۆ پێکەوە کۆ بکاتەوە. گەر ئەوانەی هێرشیان کردە سەرم، بۆ ساتێک بگەڕێنەوە بۆ ویژدانیان و دەست لە دابەشکردن و پۆلێن بەندی مرۆڤەکان بەسەر (ئێمە) و (ئەوان) دا هەڵبگرن، کۆمەڵگەیەکی تەندرووست ترمان دەبێت.
من وەک پیاوێکی تەمەن چل و دوو ساڵ بە دوو کچی منداڵەوە، کە تەنیا لە ڕێگەی مۆسیقاوە بژێوی ژیانی دابین دەکات، لە کارەکەی خۆمدا پرۆفیشناڵم و باج و خەراجیش ئەدەم. داهاتی ساڵانەم لە ڕێگای ئەلبوومی گۆرانی و چەند کۆنسێرتەوە دابین دەبێت و داهاتێکی دیکەم نییە. من بەرپرسیارێتییەکی زۆرم سەبارەت بە ئایندەی منداڵەکانم لەسەر شانە و هەرگیز ڕێگە نادەم کەس بێڕێزی بە پیشەکەم بکات. تا ئێستاش تەنانەت یەک فلسم بۆ پشتیوانیکردن نەداوەتە هیچ دامەزراوەیەک و هەموو ئەم جۆرە تۆمەتانەش رەت دەکەمەوە.
هونەرمەندانی هەموو دونیا، یەک زمان و یەک ستایلی پێشکەشکردنی تایبەت بە خۆیان هەیە، کە لە ڕێگەیەوە خۆیان رادەگەیەنن. من لە بەر ئەوەی تامەزرۆیی گوێگرانم لە کۆنسێرتەکانمدا بە نیشانەی سەرکەوتنی خۆم زانیوە، بە دروشمی سەرکەوتن بە خێرهاتنم کردوون. ئەم دروشمە بووەتە تایبەتمەندییەکی من، کە بێگومان لە هەموو بەرنامە تەلەفزیۆنییەکانمدا بینیوتانە. بێجگە لەوەش ئەم درووشمە بە خێرهاتنێکی دووبارە و قاڵبێکە لە سەرانسەری جیهاندا لە لایەن سیاسەتمەداران، هونەرمەندان، پاڵەوانانی وەرزشی بەکار دەهێنرێت. ئەم دروشمە (V) کە پیتی یەکەمی وشەی (Victoria)یـە، بە مانای سەرکەوتنە و نابێت لەوەدا بە دوای مانایەکی دیکەدا بگەڕێن.
لە بەشێکی گۆرانی (تـووشـی دەردیـسـەرم) گوتبووم:



(کۆمیسێرێ بە پاڵتۆکەیەوە/ خەریکە دێتە گیانمەوە/ بە گوللە قانونییەکانییەوە...) لە کۆنسێرتەکە بەمجۆرە گوتوومە: (تورکیا دیسان بە کۆمارییەکەی/ خەریکە دێتە گیانمەوە/ بەگوللە قانونییەکانییەوە...) بیرم لەوە نەدەکردەوە گۆڕانکاری بەم جۆرە بچووک بە تاوان لە قەڵەم بدرێت، چونکە هەموو کۆمیسێرەکان گوللە بەکار دەهێنن، تەنانەت پۆلیسەکانی کۆماری تورکیاش! لە بەشێکی دیکەی گۆرانییەکدا گوتبووم: (پیاوکوژێکی ریش چڵکن/ ئەگەڕێت بەسەر سنگما.)) ئەمەم لە بەرنامەی راستەوخۆدا بەم جۆرە گوتووە: (کۆمیسێرێکی ریش چڵکن/ ئەگەڕێت بەسەر سنگما.) هەردووکیان (پیاوکوژ) و (کۆمیسێر) دەکرێت ریشیان چڵکن بێت... سەرباری ئەوەی هەموو ئەم دێڕە بێجگە لە گاڵتەیەک و توانجێکی تەنزئامێز شتێکی دیکە نییە.

چەندین ساڵ بەر لە ئێستا، لە هۆنراوەیەکمدا دەستەواژەی (شازادەیەکی گاڵتەجاڕ) هاتبوو... کاتێک ویستم لە ئەلبومەکەمدا بیڵێم رووبەڕووی گرفت بوومەوە و تەنیا کاتێک کە گۆڕیم بۆ (شازادەیەکی قژلوول) مۆڵەتی وەرگرت! بە بڕوای من نووسەرانی (دەستوورو یاسای تورکیا) ش دەبێت وەڵامدەرەوەی کۆمەڵێک خاڵی تەنزئامێزبن کە لە نووسینەکانیاندا هەیە! میللەتی ئێمە دەبێت بزانێت چەندە لە جیهانی ئەمڕۆوە دوورن، تاوەکو ئیدی نیگەرانی پارچە پارچە کردنی وڵات نەبن، ئەویش بە هۆی گوتنی تەنیا یەک گۆرانی کوردییەوە.

ئەم جۆرە ڕوانینە بۆ هونەر دەبێت لە ناو ببرێت، دەبێت فەزای هەناسەدان بە هونەرمەند بدرێت. هەر سیستمێکی یاسایی کە لەسەر بنەمای ویژدان بنیات نرابێت ناتوانێت مۆسیقارێک کە چەندین ساڵ بەرهەڵستییەکانی خۆی بەرامبەر پارچە پارچە کردنی وڵات راگەیاندووە، تۆمەتبار بکات. من ئەوەی کە خەڵکی بە چرپە دەیڵێن، هاواری پێدەکەم. ئێمە لەم وڵاتەدا دەژین و گەر حەقیقەتەکان بزانین ژیان و وڵاتێکی باشترو پێشکەوتوترمان دەبێت.

وا دەردەکەوێت منیش دەبێت لە ئێستا بەدوا، لە گۆڕانکاری لە هۆنراوەکاندا وریاتربم و لە ڕاستیدا ئیدی مۆڵەتی گۆڕانکاری بچووکیشم نابێت. بەڵام ئایا ئێوە چاوەڕوانن من لە ژێر ئەم بارودۆخەدا هەست بە ئازادی بکەم؟

ئەم دادگایە بە پێکهێنانی خۆی، بەڵگە و مەنتق و دادوەری دادپەروەرانەی لە بەرچاو نەگرتووە و سەرجەم یاسا جیهانییەکانی پێشێل کردووە.

منیش بە جێیدێڵم ئەو وڵاتەی کە تێیدا منیان بە (ئاژاوەگێڕ و خاین) ناوزەد کردووە، ئەویش لەسەر بنەمای داوەریکردن لەسەر ئەو بەرهەمانەی لە کۆنسێرتەکانی ساڵانی پێشوومدا پێشکەشم کردوون).

پاش کۆتایی هاتنی بەرگرینامەکە، کڕی و بێدەنگی باڵ بەسەر دادگادا دەکێشێت. پاش پێنج خولەک مافی چوونە دەرەوە لە وڵاتی بۆ دەگەڕێننەوە و دادگاییەکە دوا دەخرێت بۆ ١٦ی حوزەیرانی هەمان ساڵ.

ئەحمەد کایا، پاش چەند رۆژ بۆ سازدانی گەشتی کۆنسێرتەکانی لە ئەوروپا، سەفەر بۆ فەرەنسا دەکات و تا کاتی دانیشتنی دواتری دادگا ناگەڕێتەوە تورکیا.

سەرچاوە:

دیوارها سخن نمی گویند

احمد کایا

ترجمە: یغما گلرویی — ایدین اقاخانی

چاپ اول: ١٣٨٦

انتشارات: نگاە



# دەنگێك هێشتا پڕ بوو لە سۆز

هیچ کەسێک ناتوانێت ناسنامە لە من بستێنێتەوە. پێویستە هەمووان ئەمە بزانن

ئەحمەد کایا



سیروان ڕەحیم

ژینی کورتم دی پڕاوپڕ بوو لە شانازی و شەرەف

عومری زۆرم دی کە دوایی هات بە ریسوایی و نەدەم

هێمن

سیمایەکی هەبوو سەرنجڕاکێش. ریشێک مینا گەواڵە هەوری ڕەش و سپی بە یەکدا هاتبوو. بـەردەوام خەندەیەکی شیرین ساباتی سەر ئەو سیمایەی بوو. ئەو لە دایکێکی تورک و باوکێکی کورد لە شاری مەلاتیا لە دایک دەبێت. لە تەمەنی شەشساڵیدا باوکی دەینێرێتە خولی فێربوونی تەمبوور. پاش ئەوەی لە کوردستانەوە «شاری مەلاتیا»وە بە خێزانیی دەچنە ئەستەنبوڵ رووبەڕووی ئاستەنگیی زۆر دەبێتەوە. ئەو لەو نەوەیەی حەفتاکان بوو «سەدەی بیست» کە سیاسەت گەلێ کات و وزەیانی کوشت. لە ئەستەنبوڵ دەبێت بە شۆفێری تاکسی، بەڵام لە ناوەڕاستی هەشتاکان و سەرەتای نەوەدەکانی سەدەی رابردوودا دەبێت بە سترانبێژی بە نێوبانگ و خۆشەویستی خەڵک، دەبێت بە ئەحمەد کایا.
ئەو سترانبێژێک بوو بۆ هونەر و هەڵوێستی جوان ژیا.
نمونەی ئەو کەسانەیش کەمن، هەمیشە وەها بووە کەسانی خودان هەڵوێست کەمن. دەبێ بەداخەوە ئێمە ئاماژە بەو دیاردە خەمگینەی مرۆڤ لە هەموو سەردەمەکاندا بکەین. ناکرێ لێرەدا هەموو هۆکارەکانی ئەو دیاردەیە بخەینە بەرچاو. « ئەوەیش ئەگەر پەی پێ ببەم، یاخود ئەگەر تۆ ئەو هۆکارانەی منت پێ پەسەند بێت». بەڵام وەک چۆن لە رۆژگەلی رەش و لە بارگەلی نالەباردا مرۆڤ دەبێ چاوەڕوانی رووی گەش و پرحەزی ژیان بێت، دیارە پێچەوانەکەیشی دروستە. هەر بەو چەشنە کەسانی وەکو ئەحمەد کایا لەوانەن لە رۆژگاری نەبوونیدا، نەبوونی جوانی و هەڵوێستدا، دەبن بە هەوێنی هەڵوێست و جوانی.
ئەو سترانبێژە یەکجار زوو مرد و ئاواتی ڤەگەری بۆ نیشتمانی ئازیز بردە ژێر گڵەوە. ئەو چوو، بەڵام ئەوەی ناچێت ئەو هەڵوێستە شایستە و خۆشکەیەتی کە هەمیشە یاد و ناوی وی بەزیندویی دەهێڵێتەوە.
ئەو لە پەیڤێکی ناوازەدا هەڵوێستی خۆی بەرجەستەکرد. بەرجەستەکردنێک بوو بە هەوێنی زیندوێتی وی. ئەو گوتی: «هەتا لە تورکیا نـەتـەوەی کـورد بە فەرمی نەناسن و هەتا دیمۆکراسی لەو وڵاتە دەستەبەر نەبێت، بەمردوییش نەمبەنەوە»...
سیاسیگەل لە پای زۆر هۆکاردا، زۆر جاران ناتوانن هەڵوێستی لەم جۆرە دەرببڕن، جیاوازییش لە نێوان سیاسی و هونەرمەندا هەر ئەو خاڵە گرنگەیە. بەڵام هەر لێرەیش دایە جیاوازی لە نێوان هونەرمەندی بە هەڵوێست و هونەرمەندێکدا دەبینین خوازیارە لە شتگەلی مەبەست و بە دەربەست خۆی لابدات.





ڕۆژی 2000.11.16 لە پاریس ئەحمەد کایا کۆچی دوایی کرد. هەر لەو شارە، لە گۆڕستانی پێرلاشێزە خرایە ئامێزی خاکەوە. پێرلاشێزە، کە دووەمین گۆڕستانی گەورەی جیهانە و نزیکەی دووسەد ساڵ لەمەوبەر ئەم جێگەیە کراوە بە گۆڕستان. فەرەنساییەکان دەربارەی دەڵێن:

«ئەم گۆڕستانە گۆڕستانی هەست و مێژووە.»

لەو گۆڕستانەدا گۆڕی کەسانێک هەن ناوداری جیهانین. ئارامگەی کەسانی وەکو فریدریک شۆپان، مۆلێر، ڕۆسۆ، ئەدیت پیاف، بەلزاک و کەسانی تریشە. دیارە ئەو گۆڕستانە بۆ کوردیش گرینگی خۆی هەیە، چونکە کۆمەڵێ کەسایەتی کورد کە لە تاراوگەدا مردن لەوێ نێژراون. یەکێک لەو کەسانە ئەحمەد کایای سترانبێژە. پاش مردنی کایا لەو گۆڕستانە، بەهەزاران کوردستانیی، کۆمەڵێکی زۆر لە دۆستەکانی کورد و عاشقانی جوانی و ئازادی لە تەدارەکێکی پڕ شکۆدا بۆ دواجار ئەم هونەرمەندە خۆشەویستەیان بەڕێکرد. ئەو بەڕێکردنە شایستەی ئەو مرۆڤەیە و دەبوو ئەو سترانبێژە هەر بەو جۆرە یان جوانتر و پڕشکۆتر لە زێدی خۆی ئەوەی بۆ ساز بکرایە. بەڵام چ دەڵێی. چ دەڵێی لە هەمبەر مرۆڤ؟ مرۆڤ لەوەتەی هەیە کێشە و ئاستەنگە بەرانبەر بە خۆی و پێشکەوتنی خۆی.

ئەحمەد کایا دەیتوانی بە جۆرێکی تر بژی و تاراوگە نەبێت بە ماڵ و بە ئارامگەی بەردەوامی. بێگومان بۆ ئەحمەدیش «هەلێکی زێڕین!» هەڵکەوتبوو وەکو کەسانی دی دەست لە کوردی بوونی خۆی بشوات و خۆشبەختانە بژی، بەڵام ئەم نەیکرد. بۆچ نەیکرد، چونکە ئەو دەیەویست خۆی بێت و شتێکی تر لە خۆیدا بەرجەستە نەکات. نەیدەویست تەنێکی نامۆ بە کۆڵەوە بگرێت.

دوێنێ ئەم دەنگە خۆش و ئازیزەمان لە پاڵ یلماز گوینایـ دا ڕاکشا. ڕاکشانێک ئیدی نایەتەوە لامان و بە تەنها شتە جوانەکانی دوای خۆی لەگەڵ خەڵکدا هەستی ئەوەمان دەدەنێ لە گەڵمان دەژی. ئەوانمان بە هیوای ڕۆژانی گەشی سەرفرازی ڕاکشاند، ڕۆژانێک بچنەوە ئامێزی گەرمی نیشتمان.

لە مەرگی کەسانی وەهادا شتگەلێکی بەرچاو سەرنجڕادەکێشن. لەو گۆڕستانە و لە نیشتمانیش بە هەزاران کەس فرمێسکیان بۆ ئەو دەباراند، بەڵام دەنگە بە سۆزەکەی وی ئەو هەزاران کەسەی گوڵباران دەکرد.

ئەحمەد کایا لە دیدارێکدا دەیگوت:

«من لە شەش ساڵییەوە دەستم پێکرد. باوکم لە تەمەنی شەش ساڵیمدا تەمبورێکی بۆم کڕی و دەستم بە فێربوونی ئەو ئامێرە کرد. ڕاستییەکەی کێشەکە لەوێوە دەستی پێکرد. لەوانەیە لە و بوارەدا لە هەمووان گوناهبارتر باوکم بێت».

ئەو کاتەی باوکی لەکارگەی ڕستن و چنین خانەنشین دەبێت، ئەحمەدیش وەکو لاوێکی خوێنگەرم لە ژێر کاریگەری بزاڤی سیاسی ئەو دەمەدا دەبێت. پاش خانەنشین بوونی باوکی بۆ ئەستەنبوڵ دەگوێزنەوە.

ئەحمەد کایا بۆ خۆی سەبارەت بە گواستنەوەی ماڵباتەکەیان دەڵێت:

«لە بیرمە ئەوە دەمەی بەڕێ کەوتین شەو بوو، ٧ کەس بوین و بەسواری ماشینێکی بار هەڵگر، خۆمان و کەلوپەلمان لە مەلاتیەوە بەرەو ئەستەنبوڵ بەڕێ کەوتین. بۆ جاری یەکەم لە ژیانمدا دەریام بینی و گوتم:

«ئاه چەند جۆگەیەکی گەورەیە.» لەوێ لەگەڵ کەسدا قسەم نەدەکرد. چونکە نەمدەتوانی وەکو ئەوان بدوێم. بۆیە وەکو لاڵێک بە کۆڵانەکاندا دەهاتم و دەچووم. بەردەوام لە شانشینەوە تەماشایانم دەکرد. جلوبەرگیان جیاواز بوو. هەڵسوکەوتیان جیاواز بوو. هەوڵم دەدا وەکو ئەوان بدوێم و

مینا وان بکەم. چومە لای بەرگدروو ویستم پانتۆڵی وەکو ئەوان بدرووم. ئەو پانتۆڵەی بەرگدروو بۆ منی دووری، بۆم نەدەگونجا. لەوان دەهات و لە من نەدەهات. ڕۆژگارێکی سەخت بوو. لە قوتابخانە هەرکەسە و بەدەوری کچێکدا دەهات. منیش ڕۆژێک بە کچێکم گوت:
«ئێ پێنج خولەک کات بە منیش بدە. دەمەوێ قسەت لەگەڵدا بکەم. بۆچ لێمان رادەکەن؟»
کچەکە گوتی:
«یاهوو تکا دەکەم. من وەڵامەکەیم زۆر لەبەر شان گران بوو.»
لە وەڵام دا گوتم:
«منیش تکا دەکەم. ئەو دەمە نەمدەزانی واتای (تکا دەکەم) چییە. وامزانی شتێکی نا شایستەم پێ دەڵێت.* ئەحمەد لە گێڕانەوەی ئەو ڕۆژانەدا دەگاتە بابەتی بڵاوکردنەوەی یەکەم بەرهەمی و دەڵێت:
«ڕۆژانی سەرەتا کاتێک یەکەم کاسێتم دەرچوو، هەستم بە هەڵچوونێکی گەورە دەکرد. ئەو کاتە هیچ توانایەکمان نەبوو. پەیوەندیمان بە هیچ تەلەفزیۆنێکەوە نەبوو. تەنانەت پارەی ریکلاممان لە ڕۆژنامەیەکدا نەبوو. بەڵام سەرباری ئەوەیش توانیمان دەنگمان بە هەزاران و بگرە بە سەدان هەزار بگەیەنین.»
کایا دەڵێت:»هەمیشە هەوڵم داوە بە ناوی جوانی و دۆستایەتییەوە گۆرانی بڵێم. بەڵام دەبێ هەمووان ئەوە بزانن هیچ کەسێک ناتوانێت ناسنامەی خۆمم لێ بستێنێتەوە. پێویستە هەمووان ئەمە بزانن.»
* بە زمانی تورکی تکا دەکەم دەبێت بە «ریجا ئەدەرم» هەڵبەتە ئەحمەد کایا ئەو دەمە هێشتا باش زمانی تورکی نەزانیووە و بۆیە تێنەگەیشتووە.



گۆڕەکەی کایا



# ئەحمەد کایا
# مرۆڤێکی کوردستانی و هاووڵاتیەکی جیهانی



**کاوه ئەمین**

لە دوای دامەزراندنی کۆماری تورکیای نوێ لە ساڵی ١٩٢٤ بە دواوە، کەمال ئەتاتورک لە هەموو بەڵێنەکانی خۆی کە بە کوردەکانی دابوو، پاشگەز بووەوە، هەموو شتێک کە بۆنی کورد و کوردستانی لێدەهات قەدەغەکرد، وشەی کورد و کوردستانی لە هەموو فەرهەنگ و کتێبە مێژووییەکاندا قەدەغەکرد بەو ئاواتەی کە نەتەوەی کورد بتوێنێتەوە و ئەگەر شتێکیشیان لێ بمێنێتەوە لە باشترین حاڵەتدا خۆیان بە «تورکی چیایی» بزانن. دەبێت چەندین هونەرمەند، نووسەر و دەنگخۆشی کورد لە بۆقەتەی تورکدا توابێتنەوە و تەنیا جارێکیش ئەو هەلەیان بۆ نەڕەخسابێت شانازی بە کوردبوونی خۆیانەوە بکەن؟ لێرەدا ئەحمەد کایا وەکو نموونەیەکی زیندوو دەهێنینەوە و باسی ژیانی سیاسی هونەرمەندێک دەکەین کە ناوەندی میدیایی تورکیا و باکووری کوردستانی هەژاند، دوای ئەوەی لە کاتی وەرگرتنی خەڵاتێکدا تەنیا لەبەر ئەوەی گوتی لە ئەلبومە نوێیەکەمدا گۆرانییەکی کوردی دەچڕم چونکە من کوردم و دڵنیام کە خەڵکانی بەهەڵوێست هەن ئەو ئەلبومەم بۆ بڵاو بکەنەوە. تەنیا ئەو دوو وشەیە بەس بوو بۆ ئەوەی تورکە فاشستەکان رق و کینەیان بەرانبەر ئەحمەد کایا هەڵڕێژن و وڵاتبەدەری بکەن و سەری خۆی هەڵبگرێت و لە تاراوگە بە حەسرەتی نیشتیمانەوە سەربنێتەوە.

ئەحمەد کایا لە ساڵی ١٩٥٧ لە مالاتیا لە خێزانێکی هەژار لە دایک بوو، باوکی شۆفێری تاکسی بوو و بەزەحمەت بژێوی خۆی و منداڵەکانی بۆ دابین دەکرا. ئەحمەد پێنجەمین منداڵی خێزانەکەی بوو، باوکی یەکێک بووە لەو کرێکارە کوردانەی کە بۆ بژێوی ژیان لە سێمسوورەوە ڕوودەکاتە شاری مالاتیا و دەست دەکات بە کرێکاری و پاشانیش وەکو شۆفێری تاکسی درێژە بە ژیان دەدات. دایکی ئەحمەد، تورک دەبێت شان بەشانی باوکی ئەحمەد منداڵەکانی بە شێوەیەکی شایستە پەروەردە دەکات. هەژاری و نەداری و چەوساندنەوە هەر لە مەنداڵییەوە بە ژیانی ئەحمەد کایا ئاشنا دەبن، ئەوەش هۆکارێک دەبێت کە کاریگەری لە سەر بیرکردنەوەی ئەحمەد کایا دابنێت لە گەنجێتیدا زیاتر ئاوێتەی خەباتی چینایەتی بێت، خۆی بە هاوڕێ و هاوکاری، کرێکار و هەژرانی ئەو وڵاتە بزانێت کە دواجار لە گۆرانییەکانیدا ڕەنگ دەدەنەوە. لە لایەک دەبێتە کەسێکی خۆشەویستی هەژران، بەڵام دەوڵەت و دامو دەستگاکانی دەبنە دووژمنی سەرسەختی ئەحمەد کایا.

ئەحمەد کایا هەر لە منداڵییەوە سەربزێو و منداڵێکی عەجول بووە و هەمیشە هەوڵی ئەوەی داوە لە دەرگا جۆرا و جۆرەکان بدات، سەری بە سینەماکاندا کردووە و ئەگەر پارەشی پێنەبوو بێت هەوڵی داوە میوەکانی باپیرەی بدزێت و بیانفرۆشێت، تا بە پارەکەی بچێتە سینەما.

لە ماوەی چل و سێ ساڵی تەمەنیدا ئەحمەد کایا شایەتی سێ کودەتای سەربازی خوێناوی دەبێت لە تورکیا، ژیانی هەزارن کەسی وەکو ئەحمەد کایا کەوتە مەترسییەوە و سەدان کەس گیران و بێ سەر و شوێن کران یانیش لە ژێر ئەشکەنجەداندا گیانیان سپارد بە تایبەتی چالاکوانە کوردەکان و چەپەکان.

دوای ئەوەی لە مالاتیاوە باردەکەن بۆ ئەستەنبووڵ، دنیایەکی نوێ بەرووی ئەحمەد کایادا دەکرێتەوە، شارێکی مەزن، فرە فەرهەنگ و فرە نەتەوە، تەوژمی چەپگەرێتی و سۆسیالیستی، کاریگەری لاوانی فەرەنسا کە بە نەوەی ٦٨ بەناوبانگ بوون، کاریگەری تەواویان کردبووە سەر لاوان و خوێندکارانی تورک و کورد، ئەحمەد کایا لە نێو ئەو تەوژمەدا خۆی دەبینییەوە. لاوان لە زۆر وڵاتدا کەوتبوونە نەشئەیەکی سیاسی و نەک دەیانویست دنیا بگۆڕن، بەڵکو تەنانەت دەیانویست لەڕێگای مۆدیلێکی نوێ جل و ڕوخسارێکی نوێوە خۆیان لە سەردەستەکان ڕزگار بکەن و کۆتایی بە زوڵم و زۆرداری چینایەتی و نەتەوایەتی بهێنن. بەڵام ئەوە نابێتە هۆی ئەوەی کە ئەحمەد کایا بتوانێت بە ئاسانی تێکەڵاوی ئەو ژیانە نوێیە ببێت و ژیانی مالاتیا بەتەواوەتی لە بیر بکات. کەمدەرامەتی وای لێدەکات دەست لە خوێندن هەڵبگرێت، بەڵام ئەو باغلەمەیەی (ئامێرێکی مۆسیقایە) کە لە تەمەنێکی منداڵییەوە باوکی بۆی دەکرێت دەبێت بە بەشێک لە ژیانی و ناتوانێت دەستبەرداری ببێت، هاوکات دەنگە خۆشەکەی بەکاردەهێنێت تا بتوانێت لەو ڕێگەیەوە نەهامەتیەکانی ژیانی و خەباتی چینایەتی و







هەندێکجاریش نەتەوایەتی دەکاتە هەوێنی گۆرانییەکانی.
لە کودەتا سەربازییەکەی ساڵی ١٩٨٠ کە بە کودەتای ١٢ سێبتێمبەر ناسراوە، دەیان هەزار کەس لە گرتوخانەکانی تورکیا پەستێنران و سەدان کەس لە ژێر ئەشکەنجەدا گیانیان لە دەستدا کە لە ناویاندا هاورێکانی ئەحمەد کایاشی تێدابوو، وەرچەرخانێکی گەورە لە ژیانی ئەو هونەرمەندە سەرهەڵدەدات، ئیدی ئەو دەیەوێت لە رێگای گۆرانییەکانییەوە پەیامی پشتیوانی خۆی بۆ هاورێ زیندانیکراوەکانی بنێرێت و پێیان بڵێت کە ئەوان تەنیا نین. ناوەرۆکی گۆرانییەکانی کە تێکەڵاوێک دەبێت لە پەیامی سیاسی و جڤاکی کە بۆ ئەو سەردەمەی تورکیا بڤە دەبن دەبنە هۆی ئەوەی کە زۆربەی دەستگا موسیکیەکان دەست بنێن بەرووی ئەحمەد کایاوە و گۆرانییەکانی بۆ تۆمار نەکەن.
یەکەمین ئەلبوومی ئەحمەد کایا سەرێشەیەکی زۆری بۆ درووست دەکات بەتایبەتی ئەو گۆرانییە کە تێیدا دەڵێت « لەو دوورە وڵاتێک هەیە کە تێیدا ژیانێکی پڕ لە خۆشەویستی تێدایە»، دیارە مەبەستی ئەحمەد کایا، کوردستانە، بۆیە لەسەر ئەو گۆرانییە دەیخەنە زیندانەوە و دادوەر داوای لێ دەکات روونی بکاتەوە مەبەستی چییە لەوەی کە دەڵێت « لەو دوورە، وڵاتێک هەیە». ئیدی ئەو گۆرانییە دەبێتە ویردی سەر زمانی دەیان هەزار زیندانی ناو حەپسخانەکانی تورکیا و ئەحمەد کایا ناوبانگێکی گەورە پەیدا دەکات. بەڵام لەگەڵ تەواو بوونی هەر کۆنسێرتێکدا، لە لایەن پۆلیسی تورکەوە دەستبەسەر دەکرێت.
دەستپێکردنی شەڕی چەکداری لە باکووری کوردستان لە ساڵی ١٩٨٤ دا، خەوێکی ناخۆش بوو کە تورکیا بە ئاواتی بینینییەوە نەبوو، بەڵام بە دیوەکەی دیکەدا راچڵەکاندنێکی مێژوویی و هەستانەوەیەکی نەتەوەیی و جارێکی دیکە بزواندنی هەستی ناسیۆنالیستی کوردانی باکوور بوو کە لە قۆناغی مردندا بوو، دەروەی کوردستان بە تایبەتی شاری ئیستەمبووڵ کە نوخبەیەکی باشی کورد سەرەڕای سڕبوونی کوردایەتییان گروتینێکی نوێیدا بە بیری ناسیۆنالیستی کوردی، هونەرمەندان و نووسەران و بەتایبەتیش خوێندکارانی زانکۆکان دەورێکی کاریگەریان گێڕا لە زیندوو

کردنەوەی هەستی کوردایەتی، ئەوە سـەرەڕای ئەوەی کە هەندێک لەوانە تەنانەت زمانی کوردیشیان لە بیر چووبووەوە، یانیش لە ژێر تەوژمی توانەوەی دەوڵەت لە لایەک و هەژمونی بیری چەپگەرایی کە حیزبە چەپەکانی تورکیا پێشڕەوایەتییان دەکرد بەڵام نەیانتوانیبوو لە ژێر هەژمونی هەستی تورکچێتیدا خۆیان ڕزگار بکەن، ئەحمەد کایا یەکێک بوو لەوانەی کە دەتوانین بڵێین کوردی هیچ نەدەزانی بەڵام کەوتبووە ژێر کاریگەری کوردایەتییەوە. سیمبوڵە کوردییەکان جارێکی دیکە ڕەواجیان پەیداکردەوە و بە تایبەتی ڕەنگەکانی ئاڵای کوردستان «کەسک و سوور و زەرد»، سەرلەنوێ سنووریان لە نێوان کوردبوون و تورکبووندا تۆخ کردەوە. لە ساڵی ١٩٩٠ دا بۆ یەکەمین جار ئەحمەد کایا لە ناو ئاپۆرەیەکی جەماوەری گەورەدا لە ئیستەنبوڵ لە کاتی گۆرانی گوتندا، ملپێچێکی کەسک و سوور و زەردی لە ملەیەوە ئاڵاند، ئەوە بوو بە تۆمەتی جودایی خوازی برایە بەردەم دادگا. ناوی ئەحمەد کایا وەکو ناوێکی نەخوازراو و قاچاخ وابوو لە ڕادیۆ و تەلەفزیۆنەکانی دەوڵەتدا نەک گۆرانیەکانی پەخش نەدەکرا، بەڵکو ناو هێنانیشی قەدەغە بوو. لە ڕۆژنامەکانیشدا تەنیا لەکاتی دادگایکردنیدا ناوی دەبـرا، بەڵام ڕۆژنامە کوردییەکان یان ئەو ڕۆژنامانەی کە بە تورکی دەردەچوون لە لایەن وڵاتپارێزانی کـوردەوە، ئەحمەد کایا دەنگدانەوەیەکی گەورەی هەبوو و تا دەهات جەماوەری ئەو هونەرمەندە بەرەو لووتکە هەڵدەکشا، بەتایبەتی لە شارە کوردییەکانی وەکو (ئامەد)دا ئەحمەد کایا بوو بە کێوێک و پشت و پەنای ئازادیخوازانی کورد. هەر بۆیە ئەحمەد کایا لە چەند سترانێکی خۆیدا بە باڵای دیاربەکر پایتەختی باکووری کوردستانیدا هەڵدا و تەنانەت ئەو ستایلەی کە ئەو گۆرانی پێ دەگوت بووە سەرچاوەی ئیلهام بۆ چەندین گۆرانیبێژی دیکە کە لەناو شۆڕشی کوردا دەوری باڵایان هەبوو. لە ساڵانی نەوەدەکانی سەدەی ڕابردوودا، شۆڕشی باکووری کوردستان بووە شۆڕشێکی جەماوەری و سەرتاسەری، خۆپیشاندانەکانی نەورۆزی ١٩٩١ و دواتریش تورکیایان هەژاند بە تێپەڕبوونی کات داواکاریەکانی کورد بوونە فاکتەرێکی گەورە کە ئیدی هەنگاو بۆ دواوە هیچ مانایەکی نەبوو، ئەحمەد کایا ئەگەرچی هیچ کاتێک نەبووە ئەندامی هیچ پارتێکی کوردی، بەڵام یەکێک بوو لەو دەنگانەی کە بەبەردەوامی پشتیوانی لە داخوازی جەماوەری کورد دەکرد. ڕێکخراوە مەدەنییەکانی کوردستان وەکو قارچک لە هەموو شوێنێکی باکووری کوردستان و شارە گەورەکانی تورکیا هەڵدەتۆقین و تورکیا نەیدەتوانی ڕێگایان پێبگرێت، سەدان و هەزاران کەس بێ سەر و شوێن کران، یەکێک لەو ڕێکخراوانەی کە دەورێکی گرنگی بینی لە بزووتنەوەی ئازادیخوازی کورددا، ڕێکخراوی «دایکانی شەممە» بوو کە هەموو شەمەیەک لە گۆڕەپانەکاندا کۆدەبوونەوە و داوای چارەنووسی بێسەر و شوێنەکانیان دەکرد. ڕێکخراوگەلی لەو جۆرە لە ساڵانی حەفتا و هەشتاکاندا لە وڵاتانی لاتینی ئەمریکا دەورێکی کاریگەریان گێڕا لە کەنار خستنی ڕژێمە دیکتاتۆریەکاندا، ئەحمەد کایا پشتیوانی تەواوی دایکانی شەممەی دەکـرد و تەنانەت وەکـو ڕەمزێک یەکێک لە ئەلبومەکانی خۆی بەناو «دایە» بڵاو کردەوە.

لە مانگی ئـازاری ١٩٩٨ ئەحمەد کایا لە لایەن فۆندی مەگەزینی ڕۆژنامەنووسانەوە وەکو «گۆرانیبێژی ساڵ» هەڵبژێردرا و خەڵاتی ئەو ساڵەی پێ ڕەوابینرا، بەڵام لە کاتی وەرگرتنی خەڵاتەکەدا کە سەدان کەسایەتی ڕۆشنبیری و هونەری تورکیا بەشدریان کرد، تەنیا لەبەر ئەوەی گوتی:» سوپاسی هەموو ڕێکخراوەکانی مافی مرۆڤ، دایکانی شەممە و خاوەنکارانی میدیایی و کۆمەڵگەی تورکی دەکەم کە منیان بە شایستەی ئەو خەڵاتە بینی. دەبێت ئەوەش بڵێم کە من لە ئەلبومی داهاتومدا گۆرانییەک بە کوردی دەڵێم وکلیپێکی بۆ دەکەم. من دەزانم کە مرۆڤی ئازا هەن کە ئەو ڤیدیۆیەی من بڵاو دەکەنەوە، ئەگەر نا نازانم ئەوان چۆن کۆمەڵگەی تورکی سەر ڕاست دەبێتەوە». ئەو قسانەی ئەحمەد کایا گۆمەکەی بەتەواوەتی شڵەقاند و پەردەی لەسەر ڕووی ڕاستەقینەی فاشیزمی تورکی هەڵدایەوە، ئەوە بوو بەشێکی زۆری بەشداربووان کەوتنە سەرزەنشتی ئەحمەد کایا و ڕەجمیان کرد و بەپاڵ لە هۆڵەکە کردیانە دەرەوە. ڕۆژی دوایـی و دواتریش ڕۆژنامەکانی تورکیا



به مانشێتی گەورە نووسیان «شەرفسز ئەحمەد کایا — ئەحمەد کایای بێشەرەف»، ئەوەبوو ئیدی هونەرمەندێکی وا لەو وڵاتەدا جێگای نەبووەوە و ناچار کرا بچێتە هەندەران و لە فەرنسا گیرسایە، بەڵام ئەحمەد کایا بەو هەڵوێستەی بەرەو بەرزایی رۆیشت، ئیدی کوردبوون و هەستی نەتەوەیی گەیشتە لوتکە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، ئەحمەد کایا خۆی بە هاووڵاتیەکی جیهانی لەقەڵەم دەدا و هەمیشە برایەتی گەلان وێردی سەرزمانی بوو.

لە دوای دەستگیرکردنی عەبدوڵڵا ئۆجەلان لە فیستیڤاڵێکی فەرهەنگی گــەورەدا کە زیاتـر لـە سـەد هـەزار کەس بەشداریان کرد، ئەحمەد کایا بە دەنگێکی بڵند داوای ئازادی کوردستان و ئازادی ئۆجەلانی کرد، کاتێکیش لە یەکێک لە گۆرانییەکانیدا گوتی «ئێمە هەموو بیری ئاپۆ» دەکەین بیری ئـازادی دەکەین، ئیدی خەتی کوردایەتی خۆی جیاکردەوە و بەتەواوەتی میدیاکانی تورکیایی لەخۆی هارکرد. ئەحمەد کایا هیچ کاتێک نەبوو بە ئەندامی پارتی کرێکارانی کوردستان، یان هیچ پارتێکی دیکە، وەکو هونەرمەندێکی بێلایەن مایەوە، بەڵام مێژوویەکی بۆخۆی نووسیەوە و هەتا هەتایە نەمری خۆی راگەیاند. لە ١٦ نۆڤێمبەری ساڵی ٢٠٠٠ دا، بە حەسرەتی ئازادی و گەرانەوە بۆ نشتیمان بە یەکجاری دڵە گەورەکەی لە لێدان کەوت، تەنانەت تورکیا رێگای نەدا تەرمەکەی لە باوەشی ئامەددا بە خاک بسپێردرێت و لە پاریس لە نزیک دکتۆر قاسملو و یەڵمازگۆنای بەخاک سپێردرا.

ئەحمەد کایا بووەتە سیمبوڵی ئازادی و دۆستێکی هەتا هەتایی نەداران و هەژارانی کورد و نەتەوەکانی دیکە جیهان، بۆیە ساڵانە لە یادی کۆچی ئەو کەڵە هونەرمەندەدا سەدان هەزار مرۆڤی کورد پێی دەڵێن «ئەحمەدۆ بیرت دەکەین و لەیادمان ناچیت».



گۆڕەکەی ئەحمەد کایا



# دوای ١٣ ساڵ داوای لێبوردن لە ئەحمەد کایا دەکەن.!

**لە تورکییەوە: شەماڵ ئازاد**

کۆمەڵەی ڕۆژنامەنووسانی گۆڤار، خەڵات دەبەخشێتە ئەحمەد کایای گۆرانیبێژی کۆچکردووی کوردی تورکیا و داوای لێبوردنیشی لێدەکات بەرامبەر ڕووداوەکەی ساڵی ١٩٩٩ کاتێک لە ئاهەنگێکی خەڵات دابەشکردندا کە کۆمەڵەی ناوبراو ڕێکیخستبوو، هێرش کرایە سەر ئەحمەد کایا بەهۆی وتنی گۆرانی بە زمانی کوردی . بەگوێرەی هەواڵێکی ڕۆژنامەی سەباح، ئەو کۆمەڵەیە بڕیاری داوە هەموو ساڵێک خەڵات بە ئەحمەد کایا ببەخشێت. ئەو خەڵاتە کە بە ئامادەبوونی گولتەن کایا هاوسەری هونەرمەندی ناوبراو پێشکەش دەکرێ، خەڵاتەکە لەلایەن ساڤاش ئای کە دۆستێکی نزیکی ئەحمەد کایا بوو، درا بە ئومێد یەڵماز گولتەن کایا هاوسەری ئەحمەد کایا ڕایگەیاند: مەسەلەی بەخشینی خەڵات بە ئەحمەد کایا ماوەی دوو ساڵە باسی لێوە دەکرێ وتیشی: ئەحمەد کایا پیاوی هونەرو موزیک بوو، بەخشینی ئەو خەڵاتە شتێکی باشەو پێویستە بکرێ، ئێمە لەو ڕووداوەی ئەو شەوە کە لەساڵی ١٩٩٩ دا ڕوویدا، تووشی غەمبارییەکی زۆر بووین، بەڵام ئێستا ئێمە دڵخۆشین بە بەخشینی ئەو خەڵاتە تایبەتییە کە دەبێتە مایەی ڕەوینەوەی ئەو خەم و دڵشکانە، سوپاس بۆ ئێوە و بۆ خەڵاتەکەتان، سوپاس بۆ حکومەتی (ئاک پارتی) و سەرۆک کۆمار و سەرۆک وەزیران، کە چەندین جار بە گۆرانییەکانی کایا فرمێسک لەچاویان هاتووەتە خوار، من ئەوەندەیان پێدەڵێم لەبری ئەو فرمێسکانە خەون و ئاواتەکانی کایا بەدی بێنن، کە ئەویش تورکیایەکی ئازاد و سەربەستە بۆ هەموو هاووڵاتییەکانی بە بێ جیاوازی نەتەوە و ئاین و زمان و ڕەگەز، ئەگەر ئومێدێکمان هەبێت دوای کایا، جگە لەمە هیچی تر نییە .!!

ئومێد یەڵمازیش کە بۆ ماوەی ١٠ ساڵ بەڕێوەبەری ئۆرکێسترای ئەحمەد کایا بوو، وتی: شانازی دەکەم کە لە جیاتی ئەحمەد کایا ئەو خەڵاتە وەردەگرم. ئەحمەد کایا لە ساڵی ١٩٩٩ لە کاتی ئاهەنگی خەڵات دابەشکردنی کۆمەڵەی


Hürriyet

Vay şerefsiz

Şarkıcı Ahmet Kaya, milyarlar kazanıp ekmeğini yediği Türkiye'ye yine kin kustu, "Arabamı, şerefsizlerin memleketinde bıraktım" diyerek 64 milyona hakaret etti.

YİNE KIYAFETİ İLE KONUŞULDU

Çıplak ayaklı Merve

Fikstür çekildi

Borsa coştu

Rauf yanında hep bir kurşun taşırdı

ڕۆژنامەنووسانی گۆڤار، لەبەر ئەوەی بە کوردی گۆرانی وتبوو، هێرشی کرابووە سەر. دوای ڕووداوەکەش ئەحمەد کایا درا بەدادگا و پاشان ناچاربوو تورکیا بەجێبهێڵێت و رووبکاتە ئەوروپا. ئێستا و لە ماوەی دوو ساڵی ڕابردوودا چەندین دەزگای ڕۆشنبیریی و ناوەندی هونەریی و تەنانەت تەلەفزیۆن و کەناڵەکانی میدیای تورکیا، هەریەکەیان بەشێوازێک پێشوازی لە هونەر و مەزنی ئەو هونەرمەندە دەکەن، ڕۆژنامەی حوریەتی تورکی لە یەکێک لە ژمارەکانیدا لە ژێر ئەم مانشێتەدا نووسیویەتی (ئەحمەد کایا..ئەو هونەرمەندەی قەدری نەزانرا.!) بابەتێکی بڵاوکردووەتەوە، لەو بابەتەدا کە لە شێوەی ڕیپۆرتاژدایە دەیان نووسەر و شاعیر و هونەرمەند و تەنانەت کەسایەتی سیاسی و پەرلەمانتار قسەیان لەسەر هونەری کایا کردووە و پێیان وایە تورکیا دڵڕەق بووە لە وەدەرنانی ئەم هونەرمەندە مەزنە، لە دوا بەشی ڕاپۆرتەکەدا ئومێد یەڵماز وەک بەرپرسی کاری مۆزیکی و ئۆرکسترالی کایا چەند دێڕێکی کەمی وتووە بەڵام پڕ لە مانا و جۆش و خرۆش، یەڵماز بەم شێوەیە باس لە کایا دەکات « سوپاس بۆ داوای لێبوردنەکەی ڕۆژنامەنووسانی گۆڤار، سوپاس بۆ هونەرمەندانی نەتەوەپەرستی تورکیا کە ئێستا بە هۆش خۆیان هاتوونەتەوە و لە مەزنی کایا تێگەیشتن، بەڵام کاتێک لە ساڵی ١٩٩٩ کایا بەس لەبەر ئەوەی وتی کوردم داوایان لە دەوڵەت دەکرد ملی بکرێت بە پەتدا، داوایان دەکرد ئەحمەد کایا لە زیندانەکانی تورکیا توند بکرێت، من هیچم نییە بۆ ئەوان بەڵام ئایا تورکیا دوای مردنی ئەم هونەرمەندە مەزنە هەست بە شەرمەزاری ناکات؟!

ساڤاش ئای، دۆست و هاوڕێی نزیکی کایا بەم شێوەیە باسی خەڵاتەکەی کرد (ئەحمەد کایا کوڕی ئەم نیشتمانە بوو، بەڵام بەداخەوە لە تاراوگە و لە غەریبیدا سەری نایەوە، هیوادارم ئەمە دواهەمین هونەرمەندی تورکیا بێت لەسەر گۆرانی وتن لە نیشتمانەکەی خۆی دوور بخرێتەوە، داواکارم لە ڕۆژنامەی سەباح و ڕۆژنامەنووسەکانی ئیتر دوای ئەو ڕوداوە بیر لەوە بکەنەوە بابەت و ستراتیژی ڕۆژنامەکەیان خزمەت بە تورکیا و مرۆڤەکانی بکات، خزمەت بە دەرکردن و ڕاوەدونانی هونەرمەند و مرۆڤە مەزنەکانی نەکات، چونکە لە بیست ساڵی ڕابردوودا ئـەوەی میدیای تورکیا لە ژێرناوی ئـازادی بە مرۆڤەکانی ئەم نیشتمانەی کردووە، هەرگیزاو هەرگیز دوژمنەکانیشمان نەیکردووە، بیرتان نەچێـت خۆشەویستان ئێوە بە وشە زبر و توندوتیژەکانتان دڵی سەدانی وەک کایاتان هەلا هەلا کرد، ئیتر پێمناڵێن ئازادی بۆ ئێمە چ مانایەکی هەیە؟ ئازادی ئەو کات مانای هەیە هەموو مرۆڤەکان بە جیاوازی بیرکردنەوەیاندا توانای گوزارشت کردنیان هەبێت لە خۆیان، بـەڵام ئەو بارودۆخەی میدیا لە ماوەی بیست ساڵی ڕابردوودا لە تورکیا خولقاندوویەتی هیچ دەرفەتێکی بۆ ئەمە نەهێشتووەتەوە.



**خاتوو دانیال میتران لەگەڵ ئەحمەد کایاو خێزانەکەیدا**

# سەردار ئۆرتاچ:

# داوای ئەحمەد کایا و



له تورکییەوە: کاروان نیعمان

دوای ئەوەی لە شوباتی ساڵی ١٩٩٩ لە کاتی بەڕێوەچوونی مەراسیمی بەخشینی خەڵاتەکانی کۆمەڵەی گۆڤارە ڕۆژنامەوانییەکان لە شاری ئیستەنبوڵ بە هونەرمەندی مەزنی کورد ئەحمەد کایا، وەک یەکێک لە هونەرمەندانی ساڵ، لە بەرامبەردا، سەردار ئۆرتاچ گۆرانیبێژێکی بەناوبانگی تورک لە ناو بینەرانەوە هەڵسایە سەرپێ لە بری دەستخۆشی و پیرۆزبایی دەیان قسەی بازاڕی بە کایا وتو و چەقۆ و چەتاڵەکەی بەردەمیشی گرتە سەر شانۆ بۆ ئەوەی ئەحمەد کایا بریندار بکات، بەمەش نەوەستا بە شێوەیەکی عەفەویانە چوویە سەر تەختەی شانۆ و گۆرانییەکی میللی تورکی بەسەر تورک و مستەفا ئەتاتورکدا وت. ڕاستە لە ناو بینەرانەوە بە چەپڵە و هوتاف و هاوارکردن پێشوازی لەم هەڵوێستەی سەردار ئۆرتاچ کرا و تەنانەت دوای دوو ڕۆژ لە ڕووداوەکە زۆربەی ڕۆژنامە و میدیاکانی تورکیا بە تورکی ڕەسەن و ئازاو و بوێر ناویان برد.

ئەم هەڵوێستەی سەردار ئۆرتاچ و زۆرێک لە هونەرمەندان و ڕۆژنامەنووسانی تورک تەنها لەبەر ئەوە بوو لەو مەراسیمەدا کایا وتی لە ئەلبوومی داهاتوومدا گۆرانییەک بە کوردی دەڵێم و کلیپیشی بۆ دەکەم، چونکە من بە ڕەچەڵەک کوردم و پێویست دەکات بە زمانی دایک گۆرانییەک بڵێم.

ئەم شەڕەی کایا و سەردار ئۆرتاج بەوەوە نەوەستا، هەوادارانی کایاش خۆیان پێنەگیرا و پەلاماری (سەردار ئۆرتاج)یان داو بە هوتافی برۆ دەرەوە ڕەگەز پەرست هێرشیان کردە سەر، دوای چەندین ساڵ لەم هەڵوێستە و دوای کۆچی دوایی ئەحمەد کایا، لە چاوپێکەوتنێکیدا لەگەڵ ڕۆژنامەی (ئەکشامی تورکی) سەردار ئۆرتاج دوای چەندین ساڵ بەسەر ئەم هەڵوێستەیدا دەڵێت "داوای لێبوردن لە ڕۆحی پاکی کایا دەکەم، داوای لێبوردن لە هاوسەرەکەی و لە گوێگران و لە هاووڵاتیانی کورد لە تورکیا و تەواوی دونیا دەکەم، ئەو هەڵوێستەم هەڵچوونێکی هەرزەکارانە و ساتە وەختانە بوو، نەدەبوایە وا بکەم، بەڵام تازە ڕووداوەکە ناگەڕێتەوە و لە دڵەوە لەو هەڵوێستەم پەشیمانم.

پاش ئەم چاوپێکەوتنە لە چاوپێکەوتنێکی تری تەلەفزیۆنیدا، کاتێک خانمە پێشکەشکارەکە پرسیاری لە سەردار ئۆرتاج لە بارەی ئەو هەڵوێستە توندەی بەرامبەر بە هاوپیشەیەکی خۆی کە (ئەحمەد کایا) بوو، ئێستا چ هەڵوێستێکی هەیە، ئایا پەشیمان نییە لەو کارەی؟ ئۆرتاج، وتی "پەشیمانی دادم نادات، زۆر نیگەرانم، هەرچەند ئەو کاتە من هەرزەکار و کاڵفام بووم، بەڵام میدیای تورکیا زۆر هاندەر و پشتگیریی ئەو هەڵوێستەی دەکرد، دوای چەند ڕۆژێک میدیاکان منیان بە پاڵەوان و ڕووداوەکەش وەک سەرکەوتنێکی گەورە باس دەکرا.!

من چەندین جار و لە چەندین شوێندا بە دەنگی بەرز وتوومە داوای لێبوردن لە ئەحمەد کایا و هەموو هەوادارانی دەنگی دەکەم، لەم کارە زیاتر هیچ شتێکی تر شک نابەم بیکەم،



# لێبوردن لە گەلی کورد دەکەم.!

تا ئێستا و دوای مردنی ئەو هونەرمەندە بیکەم بۆ ئەوەی ڕۆحی ئەحمەد کایای پێ شاد بکەم.!

پێشکەشکارەکە سوور بوو لە ئیحراجکردنی سەردار ئۆرتاج، پێی وت لە بری داوای لێوبردن ئایا خێزانەکەی و هەوادارانی دەنگی لە بری ئەو بەخشینە داوای ئەوەت لێبکەن گۆرانییەک بە کوردی بڵێیت ئامادەیت بەو کارە هەڵسیت؟ لانی کەم بۆ ئەوەی هەوادارانی ئەو هەڵوێستەی تۆیان لە بیر بچێتەوە؟ لە وەڵامدا سەردار ئۆرتاج کەمێک بێ دەنگ بوو، بە دەنگێکی هێمن وتی "باوەڕ بکەن کوردی نازانم، بەڵام ئەگەر بزانم سەرکەوتوو دەبم لە گۆرانی گوتن بە زمانی کوردی بۆ ئەو هەڵوێستەی کایاش بێت گۆرانییەکی کوردی دەڵێم، بۆ ئەوەی ڕۆحی ئەو شاد بێت و گوێگرانی ئەویش لەو هەڵوێستە توندەی من ببورن.! بەڵام پرسیارەکە ئەوەیە ئایا ئەو گۆرانییەم وت، هەوادارانی کایا ئامادەن من لە ڕیزی هونەرمەندە ڕەگەزپەرستەکان ببەنە دەرەوە؟ چونکە ئەوان بەردەوام لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان من بە ڕەگەزپەرست و تورکی توندڕەو ناو دەبەن، ڕەنگە ئەم هەڵوێستەیان توند بێت، بەڵام تورک هەمیشە وتەیەکی بەناوبانگی هەیە و دەڵێت"هەمیشە توندی بە توندی وەڵام دەدرێتەوە.!"

بۆیە هیوادارم ئەم قسانەم کە چەند جارێک دووبارەم کردووەتەوە کۆتایی بێنێت بەو هەڵوێستە توندەی من بەرامبەر بەو هونەرمەندە مەزنەی ناوی (ئەحمەد کایا) بوو.




**ئەکتەرو هونەرمەندێکی تورک لەسەر گۆڕی ئەحمەد کایا**

# Hunermend Ahmed Kaya

Mesud Zîlan



## Pêşekî

Êvara 12´ê şubata sala 1999 ”Komeleya Rojnamevanên Magazînê” li hola Princess Otel´ê li bajarê Stenbolêmerasimek saz kir. Herçî hunermend ûmuzîsyen ûsînemavan û televizyongar û navdarên wêçîn û tebeqê yê Turkîyê hebûn her hemî li wêbûn. Xelata ”Baştirîn Hunermendê salê” - ku li Turkîyê mezintirîn naznavê xelata musîkîye, çibû bo Ahmed Kaya. Merasim ji ekranên televizyonan zindî dihat weşandin, ji alî .milyonan ve dihat temaşekirin

Ahmed Kaya di dema wergirtina xelatê de axavtinek pêşkêş kir,di dawyêde got ezê klibekî Kurdî bikşînim!Her li gel wê gotinê, ewmezin-mirovên çîna hunera Turkî li ser mêzan kevçik û çetel,bardax û çaqo nehîştin ku neavêjin Ahmed Kaya. Borre borra ”hunermend û rojnamevanan bû sirûdên nijadperestdigotin, siloganên nijadperest û Kemalîst diqêrîyan. Ewê ku ciwên didan, ewên ku xwe digijgijandin û hêriş dikirin… Hol bibû .toqek agir û li Ahmed Kaya dihat hev. Revî revî canê xwe rizgar kir Ahmed wêşevê

Rotira dinê ragîhandina Turkîyê bi manşêtên ”xayînê niştîman” Kaya kirin hedef. Turkîyê di wateya peyvêde .jîyan li Kaya teng kir, jehr kirheta ku ji refên wî dûr xist li Parîsê kuşt, şehîd kir

Ahmed Kaya di emrekî gelek zû, hîn di 43 salîya xwe de koça dawîn kir lê navekî wek çîya, şanekî şayenî MIROV li pey xwe hîşt. Bi sekn û kesayetîya xwe, bi huner û helwêsta xwe Ahmed Kaya navê xwe di dilê milyonan de nivîsî. Ewên ku wê şevê destên xwe dirêjî wî kirin, hêrişî wî dikirin, ciwên didan, îro li wî digerin, poşmanîya xwe tînin ziman, şermezarin, bi şermezarî derdikevin pêşberê eynikê, pêşberê mirovan. Recep Tayyib Erdogan (serokê Partîya Dad û Geşepêdan û Serokwezîrê niha yê Turkiyê) di serî de, gelek kesan heta niha di çendîn derfet û munasebeda lêborîya xwe xwestine ji bo ya ku Turkîyê anî serê Ahmed Kaya. Serdar Ortaç (hunermendê navdarê turk ku bi xwendina sirûda 10 salîya Komara Turkiyê - ew sirûd di serdema desthilata AKP/Erdogan de hat qedexekirin û ji bernameya xwendinê hat derxistin, Ahmed Kaya protesto kir û rolleke serekî dît di hêrişbirina ser Ahmed Kaya de, heta niha 50 carî li ser ekranên .televizyonan lêborîya xwe xwestîye, poşmanîya xwe anîye ziman

Koça dawîn ya Ahmed Kaya li sirgûnê, wek ya Yilmaz Guney û Nazim Hikmet li ser astê cîhanê li lekeyên .reş yên rûyê dewlet û komara Turkiyê lekeyek zêdekir

?Gelo kîye ev kesayetîyê pir reng û bi huner? Ahmed Kaya ji ku hat, di ku re derbas bû, kî bû, ji ku bû .Fermon geştek bo nav jîyaneke wek bahoz, kurteçîroka jîyana Ahmed Kaya

***

## Hunermend Ahmed Kaya

Ahmed Kaya roja 28´ê cotmehê sala 1957 li bajarê Meletyê ji dayikek Tirk û baveke Kurd hat dunê, di rêzêde zarokê dawîn yê pêncan bû. Bavê wî ji ber debara jîyanê ji Semsûr (Adiyaman)ê çibû li Meletyê cîwar

.bibû, diya wî ji Erzorumê bû. Semsûr û Erzorum û Meletî jî dikevin nav erdnîgarîya Bakûrê Kurdistanê

Bavê Ahmed li kargeha qumaş kirêkar bû. Kaya dibistana seretayî li Meletyê xwend. Bi saz û muzîkê re di .zaroktîya xwede aşina bû

?Çawa dest bi muzîkê kir, kî Ahmed Kaya ”keşif” kir

Di rastîde yekemîn kesê ku Ahmed Kaya keşif dike bavê wî ye. Bavê Ahmed di 6 salîya roja rojbûna wî de bi diyarîyek tê malê ku ji bejna Ahmed drejtir e. Ev diyarîya ku dê dûre bibe emraz û hokarê çarenivîsa jîyana wî Ahmed Kaya, sazeke baxlama ye. Ahmed her di wê salê de baxlama fêr dibe û stran dibêje. Tarza ku Ahmed dijene û dibêje, li tu kesî û li ya tu kesî naçe. Malbat ji destê ”barebar û qareqara” Ahmed bêzar dibin, kes guhdarîya wî nake. Ahmed gelek caran di koxê mirîşkan de stranên xwe dibêje û saz dijene, adeta .konsert dide mirîşkan

Ahmed Kaya ji ber barê jîyanê, di demên piştî dibistanê de, di dawya heftê û di pişûyande an li dukana kasetfiroşekî nasê bavê xwe an jî li ser minibusa hevalekî wî yê dinê şagirtî dikir. Herdu kar jî li gor dilê wî bûn. Li kasêtfiroş herçi kasêt û stranek bixwesta guhdarî dikir û di demên li ser minibusê jî bi qelebalixîya hozanê pir bi navûdeng û 3-însanan ve heşir neşir dibû. Îdolê Ahmed Kaya Ruhî Sû bû. Ruhî Sû,yek ji 2 .kesayetîyên çep yê wê serdemê bû, Kurd bû

Ahmed Kaya hîna 9 salî bû li kargeha ku bavê wî lê kar dikir,di şeva karkeran de derket sahnê. Berîya wê jî li gelek munasebe û ahengan sahne girtibû, lê ya şeva karkerên sendîkayê tişteke taybet bû ji bo Ahmed .Kaya

Bavê Ahmed Kaya, piştî ku ji kargeha qumaş teqawud dibe,sala 1972 koçê Stenbolê dike, li Kocamustafapaşa niştecî dibe. Debara jîyana Stenbolê li wan girandibe û Ahmed ji bo alîkarîya malbata xwe dev ji xwendinê .berdide. Ahmed Kaya ji şagirtîyê ta erebane û karê etarî,her çi karek biketa desta dikir

Xwendina Lîsê ji derve qedand. Di 16 salîya xwede bi zîndananre aşina bû. Ji bo hilwesandina plaketên .qedexe wî girtin û avêtin zîndanê

Dûre li gel çend hevalên xwe ket nav ”Komeleya Yekîneyên Gel”. Bi rêya vê Komelê û ji bo wê beşdarî di .gelek çalakî û munasebeyan de kir

Ahmed Kaya bi wî awayê jenîna Baxlamayê, bi gotina sitranê, bi hûnana hozanê tarzeke nû û cudabû, li kesî nediçû, bizarê (lasayî) kesî nedikir. Yê ku carekê Ahmed guhdarî dikir idî wî ji bîr nedikir. Ahmed Kaya li ku sahne bigirta li wir firtone radibû.Gelek caran an konsertên wî di nîvîde dihatin birîn an polîsan wî ji sahnê hildidan û dibirin, lingekî wî li derve li ser sahne û di nav muzîkêde, yê dinê li dadgeh û zîndanan bû. Lê ji .bo wî ferq nedikir, li ku bûya li wir jîyan hebû, berxwedan hebû, serhildan hebû

Ahmed Kaya eskerîya xwe sala 1978 li Gelîbolû kir. Piştî eskerîyê bi Emine Kaya re zewicî, ji wê zewacê keça wan çixdem hat dunê (sala 1982). Ahmed şev û rojên xwe dabû karê hunerî û afirandina derfetan ji bo albuma xwe tomarke. Rojek tê malê, idî Emine ne li mal e. Bi bêî ku xiber bide an notek cî bihêle, Emine´yê .çixdem hildabû û çibû. Demek şûnde jî bi rêka dadgehê ji hev cihê bûn

Yekem hevdîtina Ahmed Kaya û îdolê wî Ruhi Su

Ahmed Kaya di ahengeke Zanîngeha Boxaziçi ya Stenbolê de bo cara yekê îdolê xwe, hunermendê şorişger û navdar Ruhî Sû rû bi rû dibîne. Eve ji bo wî derfeteke mezine ji bo xwe pê bide nasîn. Her çi dike wê şevê rêyek dibîne û derdikeve pêşberê Ruhi Sû. Ahmed Kaya strana here bi nav û deng ya Ruhî Sû (Mahsus mahal) jêre dijene û dixwîne. Ruhî Sû di nîvê stranê de wi dide sekinandin, sazê ji desta digre û dibêje “Ahmed can, “!Baxlama weha nayê jenîn

.Ruhi Su ne ji tarza Ahmed Kaya û ne jî ji xwendin û jenîna wî hez nekir

Di ser wê hevdîtinê re sal derbas dibin Ahmed Kaya bi hevkarîya dost û hevalên xwe li “Komeleya Fermo eve meydan û Bilsak” şevekê saz dike. Li ser pilaketa wê şevê, wek ku tehlîqek bişîne guhê îdolê xwe Ruhi “!Sû, dinivîsîne: “Baxlama weha jî tê jenîn

Salê kudetaya 12 Eylulê û derketina Ahmed Kaya wek hunermend

Di 28 salîya xwede, sala 1985´an, Ahmed idî di wê bawerîyêdeye ku dema wî hatîye.Stran û xebatên xwe hildide û berê xwe dide Unkapani.Unkapani taxeke bajarê Stenbolêye ku li sertanserê Turkiyê bi "cîyê/navenda muzîk û hunerê tê zanîn.Herçî tomargehên bi nav û deng yên Turkîyê hene, li wir in.Yekem .pêpelûka hunermend li Turkiye, ji Unkapani dest pê dike, rêya şan û şûhretê ji wir derbas dibe

Dem û rojgarên sext bûn. Salên 80´yî li Turkîyê dozex bû, Kurdistan mazatxane. Kolan di jêr postalên esker de, maf û azadî di zîndanande kelepçekirî bû. Stranên Ahmed Kaya çi ji alî naverok çi ji alî tarz ve, bangeşt bû ji bo îsyan ji bo serhildanan. Tomargehan ji tarza wî re tu qalib û kategorî nedîtin. Kesî .nizanîbû dê vê tarzê têxin nav kîjan kategorîya muzîkî

Ji alî tekst û naverok û mesaj ve jî, çi tomargeh dikarî, diwêrî di wan rojgarande muzîkek biweşîne ku wek bangêştek ji bo serîhildanê tê guhê mirov? Ahmed Kaya bi destê vala ji Unkapani vegerya, lê tu demê .hêvîya xwe neşkênand, belku berevajî bêhêvîtî ne karê Ahmed bû û li wî nedihat

Ahmed Kaya bi alîkarî û hevkarîya hin dost û hevalan û bi derfetên xwe, yekem albûma xwe "Aglama Bebegim" (Megrî Berxa min) derxist. Album derket derneket bi biryara dadgehê hat qedexekirin û dûre jî hat berhevkirin. Ahmet li ser wê albumê hat darizandin, lê carek tîr idî ji kevan derketibû. Ahmed Kaya wek ku dibêjin; "bombeyek bû li naverasta Turkîyê teqyabû, li nav diasporaya Kurdî li cîhanê deng dabû. Tevî ku hatibû qedexekirin, kaset û stranên wî jêr bi jêr li sertanserê Turkiyê belav bibûn. Ahmed hîn bi .yekem albuma xwe, bû geştirîn sitêrk û bi asîmanê Turkiye û Kurdistanê ve zeliqî

Ji bo albuma duhem Ahmed careke din berê xwe dide Unkapani. Vê carê nav û deng e Ahmed lê…her ew nav û denga ye ku tomrgeh newêrin nêzîk bin. Tenê ji bo ku guhdarî kirine an li ser wan û dukan û malê .wan kaset û stranên Ahmed Kaya hatine bidestxistin, bi sedan genc li ber dadgeh û di zîndanande bûn

Ahmed Kaya ji bo albuma "Acilara Tutunmak" (xwespartin bi êş´an/azaran) çû cem Sezer Baxcan xwedanê tomargeha "Degişîm Studyo" (Studyoya Gorran) li Unkapni. Sezer Baxcan kekê hunermenda şoreşger ya bi nav û deng ya turkî Selda Baxcan e. Selda Baxcan destgirtîya Deniz Gezmiş´ê serkêşê nivşeya 68´an yê tevgera gencên çepgîr bû li Turkiyê, şeva 5 li ser 6´ê meha Gulana sala 1972 li gel herdu hevalên xwe Huseyin Inan û Yusuf Aslan hatin bidarvekirin. (Ertugrul Kürkçü, ku li başûr piştî hilbijartina xwe li ser lîsta BDP´ê bo parlamena Turkiyê, hat/tê naskirin, yek ji hevalên Gezmiş û (.serkêşê wê nifşêye ku hîn li jîyanêye

Selda Baxcan û Gulten Hayaloglu di kûdetaya 12 Eylulê 1980 de hatibûn girtin, di "Girtîgeha Eskerî ya Metrîsê"de hevdu nas kiribûn. Selda´yê gelek ji Gultenê hez kiribû, bi sekn û kesayetîya xwe Gulten cîyê xwe di dilê Seldayêde dike. Selda demek kurt şûnde tê azad kirin lê qet pêwendîya xwe ji Gulten´ê nabire. Gulten 4 sal piştî Seldayê ji zîndanê derdikeve û Selda bi zorê hildide û dibe li cem xwe, li ."Studyoya Gorran" kar didê

Hevnasîya Ahmed û Gulten Kaya

Di dema tomarkirina duhem albumê de Ahmed û Gulten bo cara yekê li studyoyê hevdu dibînin. Gulten nav û dengê Ahmed ji zîndanê bihîstîye û albuma wî ya yekem ya qedexekirî jî guhdarî kirye. Di albuma duhem de pêkve kar dikin, ji nêzîkve hevdu nas dikin. Ji pencereyek gelek nêzîkî hev li cîhanê, li jîyanê, li pêşveçûnan dinhêrîn. Wek penda ku dibêje "qûşxane tilol bûye qapaxa xwe dîtîye" Ahmed û Gulten jî li hev dihatin. Piştî derketina albumê - ku rekora firotinê şikand, Ahmed Kaya û Gulten Hayaloglu .zewicîn, Gultenê paşnava Kaya wergirt

Di vê navberêde dezgeha bala ya darazê, biryara qedexekirina albuma yekem (Megrî Berxa min) hilweşand. Şirketa ku album tomar kiribû, teksta tevahîya stranên albumê tevî biryara hilweşandina qedexeyîya li .ser albumê kir reklam û di rojnameyekêde belav kir. Kasêtên Ahmed Kaya rekora firotinê şikandin

Gulten Kaya hê dema di zîndanêde bû, şiira Nevzat çelik bi navê "Strana şefeqê/rojê" ji Ahmed re şandibû. Nevzat çelîk xortekî çepê Turk bû. Sala 1980 ji doza Dev-Sol´ê hat girtin, bi cezayê idamê hat darizandin. Di zîndanêde dest bi nivîsandina şiir kir. Bi xwe hîn di hundurde bû û kitaba wî hîn



derneketibû, Ahmed Kaya şiira “şafak türküsü” kir stran û nave wê jî li sêhem albûma xwe kir. Nevzat Çelîk li welatên Ewropayê bi yek ji remzên kûdetaya xwênavî ya 12´ê Eylulê nav û deng anî. Şaîr û çîna ronakbîr û hunera Ewropayê li ser dewleta Turkiyê fişarek mezin durust kirin, Nevzat çelik tevî ku bi cezayê li .sêdaredanê hatibû cezakirin, 7 sal şûnde (sala 1987) serbest hat berdan

Li gor amar û hejmarên sazî û rêxistinên mafê mirov, di dema kûdetaya 12´ê Eylulê de li Turkiyê zêdetir ji 600 hezar mirov hatin zîndanî kirin, bi hezaran mirov hatin kuştin, bi deh hezaran kes di bin îşkencên nedîtîre derbasbûn, bi hed hezaran kes bûn penaber. Li Turkîyê bi giştî û li (Bakûrê) Kurdistanê bi taybetî, mal nema ku mexdûrîyeta cûntayê nedît. Zîndan li ser pişta hev tijî bû. Bi albuma “şafak türküsü” Ahmed Kaya ne tenê di dilê kolanên Turkiye û Kurdistan belku dilê zîndanan jî girtibû. Xoşevîstîya Ahmed Kaya .di dilê guhdêrande album li pey album, roj li pey roj wek topa berfê her ku diçû mezin dibû

Ji zewaca Ahmed û Gulten Kaya, sala 1987, keça wan Melisa hat dunê. Gulten û Melîsa dibin du çavkanîyên hêz û wuzeya Ahmed Kaya ku berhem li pey berhem biafirîne. Albuma “An Gelir” (dem dê bêt) ku çarem album e, hema bigre xwerû ji hûnan û helbestên Kaya bi xwe pêk tê. Albumê ne tenê rekora firotinê şikand her weha di lîsta ”Top-10” de gihîşt lûtke û bû yekem. Ragîhandina magazin û çîna hunera Turkîyê matmayî bibûn. Ew tarza ku Ahmed Kaya afirandibû û kesî nizanibû çi navî lê bikin, Turkîyê hejandibû. Di dawya dawînde tarza Ahmed Kaya bi nave “Özgün Müzik” (Muzîka Xweser) hat pênasekirin. Tarza Ahmed Kaya bi navê ”Özgün muzîk” (muzîka xweser/taybet di muzîkê de şax vekir û niha kategorîyeke muzîkê .ye li Turkiyê



## Ahmed Kaya û Yusuf Hayaloglu

Yek ji dewlemendîyên ku Gulten Kaya li jîyana Ahmed zêde dike Yusuf Hayaloglu ye. Yusuf Hayaloglu kekê Gultenê, yek ji şaîrên here hezkirî, mirovekî bêtirs û şorişger e. Gulten di wê baweryêdeye ku ji hevkarîya Ahmed û Yusuf dikare hunerek derkeve ku dê pir cuda û bi lezet be. Rojek hersêk bi hevre derdikevin xwarinê. Yusuf Hayaloglu wê şevê teksta “Ka xortanîya min” (ku yekem ceribandina wî ye ji bo gotina stranê, dirêjî destê Ahmed dike. Ahmed bi xwendina tekstê re nema rê li hêstirên çavên xwe digre, digrî. Hemen şev çawa ku diçe mal, dest bi karkirin dike li ser wê stranê. Strana ”Ka xortanîya min” li sertanserê Turkiyê bû fenomen, bi salan ji ser zimanan neket, çendîn car derket lûtkeya lîsta ”strana herî “zêde tê guhdarîkirin

Ahmed Kaya idî berhem li pey berhem, rekor li pey rekor her roj mezintir dibû, ber bi pêş diçû. Li gel Gultenê biryar dan fîrmaya xwe vekin. ”Fîrmaya GAK ji bo çêkirina muzîkê” wana danîn. ”GAK” ji kurtkirina navên Gulten & Ahmed Kaya tê. Dû re bi hemen navî studyoyek jî vekirin. Ahmed Kaya idî ji bo çêkirina albumên

.xwe muhtacê kesî nebû lê her albumek li serê wî belayek nû vedikir

Ahmed Kaya li gel eleqeya ku roj bi roj ji bo wî mezin dibû, dest bi Konsertan kir û aranjmanê mezin û girseyî kir. Konsertên wî jî wek albumên wî an di nîvîde dihatin birrîn an dihatin qedexekirin. Serê Ahmed bi Turkîyê û yê Turkîyê jî bi Ahmed re ketibû belayê. Navê yek ji albumên xwe jî danî ”Serê min “di belayêde

Albuma bi navê ”Stranên min ji çîyayan re” 14. albuma Ahmed Kaya ye. Stranên min ji çîyayan re sala 1994 derket piyasê û 2 milyon û 800 hezar adet firot ku heta niha kesî wê rekorê derbas nekirîye. Ew album jî hat qedexekirin û berhevkirin. Ahmed Kaya bû navekî wisa, her berhemekî wî, her gotineke wî .karvedan lê diket. Bi dehan doz li ser Kaya hatin tomarkirin. Polîsxane bibûn duhem navnîşana wî

Ahmed Kaya bi tarz û muzîka xwe bi sekn û helwêsta xwe livek li kolanan durust dikir, potansiyelek dixist kar ku dewlet, sîstem, desthilat jê ditirsîya. Li holên mezin û qadên vekirî konsert bi Ahmed .nedidan kirin. Û eve jî ne tenê li cîh û deverên Kurdnişîn belku li hemû deverên Turkîyê

Cara yekê ji bo konserteke gelêrî li parka (Gulhane Park) moleta konsertê danê. Cîyê ku ji bo 70 hezar kesî bû, 150 hezar kes çûnê. Di dema konsertêde xortek xwe davêje sahnê û Ala Kesk û Sor û Zer diavêje ser şanê Ahmed Kaya. Di navbera polîs û girseya gel de şer û pevçûnên dijwar derketin, ji herdu alîyan .bi sedan kes birîndar bûn

Ji bo wê bûyerê, dozgerê giştî bi tohmeta ”propogandaya rêxistina terorê (ku mebest PKK ye) û .cudaxwazîyê li Ahmed Kaya dozeke nû vekir

Tevî ku kasêt û stranên Ahmed Kaya dihatin qedexekirin, berhevkirin, tevî ku konsertên wî dihatin astengkirin, tevî ku dewletê temamî rê û dirb lê girtibû, Ahmed Kaya di nav dilê gel de navê xwe bi pîtê zêrîn nivîsîbû. Dewlet û dem û dezgeyên wê û ragîyandina Turkiyê gelek hewl dan ku bi tarza Ahmed Kaya çend hunermendekî nijadperest perwerde bikin û derxin pêş ta ku hinek ji xoşevîstên wî rakbikêşin alîyê xwe lê nafîle. Ahmed Kaya sala 1999 xelata ”Baştirîn hunermendê salê” bidest anî. Ji xwe dûre jî .çi hat serî, wê şevê hat serî

?Di wê şevê de çi bû

Xelata ”Baştirîn hunermendê salê” naznava here bi pirestîj ya muzîkî ye li Turkîyê. Xelat bi merasimeke şahane, bi amadebûn û beşdarîya bigre temamî sitêrkên Turkiyê di hemû warên hunera muzîk û sînema û ragîhandinêde, ji xweyê wê re tê pêşkêşkirin û gelek kanalên televizyonan zindî diweşînin. Merasima wê şevê jî (12´ê şûbatê 1999) li hola Princess Otel li bajarê Stenbolê wisa bû. Ji bo wergirtina xelata Baştirîn hunermendê salê, Ahmed Kaya hat vexwendin bo sahnê. Ahmed Kaya xelata xwe wergirt, :axavtinek pêşkêşkir. Deqê wê axaftina ku berê Ahmed Kaya da Firansayê sirgunê, eve

Ez ji bo vê xelatê sipasî Komeleya mafê mirov, Daykên şembîyê, karmendên ragîhandina Magazînê û“ temamî gelê Turkiyê dikim. Daxuyanîyekî min heye. Ez hunermendekî Kurdim, di vê albuma ku min niha amde kirîye ku dê di rojên bê de biweşînim, ezê straneke Kurdî bêjim û Klib´a wê jî çêkim. Ez dizanim ku niha di nav me de televizyongarên wêrek hene ku vê Kilîpê biweşînin, lê hege neweşînin, dê çi bersîvek .“bidin xelkê Turkiyê idî ez nizanim

Li ser wan gotinan salon rabû pê. Hola wê otêla xemilandî û ew gewre jin û gewre piyawên hunera sînema û televizyon û ragîhandina Turkiyê li ser wan gotinan li Ahmed hatin xezebê. Yê ku xwe digijgijandin, yê ku ciwên didan û yê ku sirûd û siloganên nijadperestî davêtin, te digot qey welat ji dest çûye, nîştiman kesên wek 3-dagîr bûye, Turkiye hildiweşê û yê ku bûye sebeb jî li wê sahnê li pêş cave wan e. Ji bilî 2 Xwedêlêxweşbû Savaş Ay li wê hole herkesî hêrişî Ahmed Kaya kir. Dotira rojê ragîhandina Turkiyê kampanya nefretê dest pê kirin. Li dosyayên Ahmed Kaya doz û dosyayên nû hatin zêdekirin, Kaya bi .tohmeta “xiyanet li niştiman, piştevanîya terorê û cudaxwazîyê hat darizandin



Rojname û ragîhandina Turkiyê adeta ketin pêşbirkêya belavkirina resm û dîmenên Ahmed Kaya ji şev û ahengên Kurdî, li cî û welatên cuda. Resmên Ahmed Kaya bi Ala´ya Kurdistanê, li gel posterên Ocalan,

li gel berpirs û rêveberên PKK´ê, kesayetîyên Kurd… Herçi resmên ku dikaribû doza Ahmed Kaya girantir bike û bisilmêne ku Ahmed Kaya piştgirîya “terroristan dike, cudaxwazî dike”, li gel gotinên negotî ku goya .ji devê Ahmed Kaya derketine, ji manşêtan hatin belavkirin

Li ser hinek ji resm û dîmenên ku hatin belavkirin, Dadgeha Ewlekariya Dewletê ya Stenbolê, bi daxwaza 10 sal û nîv cezayê zîndanê li dijî Ahmed Kaya 2 doz vekir. Ahmed Kaya meha huzêrana hemen salê (berî ku cezayê wî sabit bibe) Turkiyê cê hêşt û çû Firansa, Paris´ê. Ahmed hîn li Firansayê bû dadgehê biryara 3 sal .û 9 meh cezayê zîndanê lê birrî. Kaya careke din idî venegerya Turkiyê, venagere

Turkiy bi sirgunkirina Ahmed Kaya ji welatî ji dost û hevalên wî, bi birrîna destê wî ji hezkiryên wî nesekinî, .belku kirîn û firotin û guhdarîkirina wî jî qedexe kir

## Koça dawîn

Ahmed Kaya roja 16.11.2000 di demjimêr 6´ê sibehêde li mala ku têde dijîya, li Porte de Versailles li Parisa paytexta welatê Firansa, bi krîza dil jîyana xwe ji dest da. Hê 43 salî bû.Wê demê li ser albuma “Bimînin di xweşîyêde çavên min” kar dikir.Strana “Karwan Diherikî” ku bû sebebê koça Ahmed Kaya ji Turkîyê, piştî .koça wî ya dawîn, di albuma “Bimînin di xweşîyêde çavên min!de derket

Mirina Ahmed Kaya di serîde li welatên Ewropayê her weha li ser asta cîhanê wek rûreşîya Turkiyê deng veda. Ahmed Kaya li Parisê li yek ji goristanên here bi nav û deng yên cîhanê bi axê hat sipardin, Le Pere Lachaise. Le Pere Lachaise ew goristanaye ku şehîdên şorişa sala 1832 ya Communa Parîsê û gelek navdarên .Parîs û Firansayê di hembêza xwe de vedişêre. Qasimlu û Yilmaz Guney jî li wê goristanê veşartîne

Wek her albumeke wî, wek her gotinek, konsertek, çalakîyeke wî, koça dawîn ya Ahmed Kaya jî li pey xwe karvedan anî. 2 sal piştî koça dawîn ya Ahmed Kaya 20 hunermendên navdar yên Turkiyê her yekê straneke Ahmed Kaya xwendin û di albumeke taybet de ji bo bîranîna wî tomar kirin. Li çend cîyan li şaredarîyên di .destê Kurdan (BDP) de navê wî li çend avahîyên hunerî hatiye kirin

.Ahmed Kaya zêdetir ji 20 album çê kir, muzîka çendîn fîlmên sînemayî danî

Albumên Ahmed Kaya yek ji yekî bi nav û dengtirin, her weha stranên wî.Çendîn stranên Ahmed Kaya di hît-lîsta “Top 10” de ketin rêza yekem. Ahmed Kaya çendîn xelatên muzîkî, hunerî wergirt, çendîn eser li pey xwe hîşt. Diyare gotina strana Kurdî li ser şaşeyên televizyona Turkiyê bedêl dixwest û Ahmed Kaya wê bedêlê da. Lema îro dengê Ahmed Kaya bi strana bi Kurdî “Kanî Diherike” li ser şaşeyên televizyonên .wî welatî bilind dibe

***



# Ahmed Kaya û barê jîyana wî

Ahmed Kaya çavên xwe vekir venekir îyaneke sext û dijwar li pêşberî xwe dît.Di her qonaxeke jîyana xwe de rastî tengasîyan hat.Gelek astengî dît, gelek tengasî kişand. Ji ber kesayetîya xwe, dîtin û helwêsta xwe, muzîk û hunera xwe, tarza xwe ya muzîkî û sekna xwe wek MIROV, Ahmed Kaya ji destê jîyan û ji destê dewletê gelek kişand. Ahmed Kaya ji bo birrîn û derbaskirina temamî tengasî û astengan tê koşa, ber xwe da, bedêl da. Ahmed Kaya ji bo her tiştekê ku di kariyera xwe de bi dest anî têkoşîn kir, rîsk hilda û bedêl da. Lema AHMED KAYA bû naznav, bû marke, bû ew îdol´a ku bi milyonan mirov di dilê .xwe de dihewînin

Salên 80´yî (ku amajeyeke bo kûdetaya eskerî ya 12. eylula 1980) li Turkiyê bi giştî, li Bakûrê Kurdistanê .bi taybetî zîndan bû, di wateya peyvê de dozex bû. Kolana kuştin û girtin û îşkencê bû Kurdistan

Ahmed Kaya di wan sal û rojgarên dijwar de derket. Derketineke weha bi xwe, meydanxwendinek bû ji dewletê, ji sîstemê, ji zulmê, biedaletîyê, newekhevîyê re. Li ba Ahmed Kaya ne etnîsîte belku mirov girîng bû, maf û azadî girîng bûn. Ahmed Kaya jîyana xwe, hunera xwe da wê rêyê. Yek albumeke Ahmed Kaya nîne ku li Turkiyê tomar bûbe an nehatibe qedexekirin, berhevkirin an jî doz lê nehatibe vekirin. Hema .bigre ji ber her stranekî xwe, ji ber her konsertek, her axavtineke xwe Ahmed Kaya çû ber dadgehan

:Çend gotin ji parastinnameya Ahmed Kaya li dadgehê

Ji bo baştir xwe bi we bidim nasîn min divê ez çend gotin erz bikim; Ez xwe hunermendek ku li hemberî" temamî kultur û ayîn û zimanên cîhanê di heman mesafê de dimeyzîne, hunermendek, ku bi qasî ku nikare !xwe aîdê tu cîyekê bibîne cîhanî dibînim. Lê dema pêvîst kir ku mirov pênaseya xwe eşkere bikin, ez Kurd´im Li ku derê cîhanê dibe bila bibe, tekoşîna min heta ku, di serîde Kurd, hebûna neteweyên ku tune tên dîtin "…neyê qebulkirin, dê bidome

Ahmed Kaya, zîndan wek zanîngeh, wek "derve" wek her qadek ji qadên tekoşînê, cîyê berxwedanê didît. Di hevpeyvînekêde dibêje: "ez niha li derve bêrya zîndanê dikim. Lê heta ku li derve bim ez stranên xwe "!dibêjim û dema min davêjin zîndanê jî, ji xwe wayê temamî hevrê û hevalên min li wir´in

Dewlet, rejîm ji bo zulmê li ku bûya Ahmed Kaya ji bo ku li dijî wî bisekine li wir bû. Di salên 80´îde zîndan muhtacê dengê xwe bû, Ahmed Kaya bû dengê zîndanan. Di wan salande bi dehan komele û rêxistinên wek "Dayikên şembîyê, rêxistinên mafê mirov, komela kesên wundabûyî" ava bûn". Ahmed Kaya ji bo .gîhandina deng û peyama wan hevkarî û alîkarîya xwe ji tu yekê ji wan komeleyan kêm nekir

Di salên 90´î de ba û bahoza kûdetayê ji ser asmanê deverên Turkî ta radeyek rabibû lê Kurdistan di destê JITEM û Hizbullahê de bibû goristana "cînayetên kiryar nediyar" û dinaland. Jitem (dezgeha hawalgîrî ya Janderme) û Hizbullah zêdetir ji 17 hezar kes (ku di navêde parlamentar, siyasi, niviskar, diktor, mafya, bazirganê Kurd) bêserûşûn kir. Musa Anter, Vedat Aydin û bi hezaran… yê ku bi fîşek hatin qetil kirin, yê ku bi kindirê ji çermê beraz hatin xeniqandin, yê ku hatin serbirrîn û yê ku hê jî …bêserûber windane

Dewletê li Kurdistanê agir dibarand lê li Rojavayê Turkîyê ji bilî Dr. Ismail Beşikçi (ku li ser pirsa Kurdî di zîndanade bû), kirrîn ji kevir dihat ji kesî nedihat. Ronakbîr kerr, rojnamevan kor û hunermend lal bûn .li beramber pirsa Kurdî û zulma dewletê li ser Kurdan. Ahmed Kaya di wan rojgarande Kurdayetî kir

Di stranên xwe de li hemberî çi isyan dikir, li sahnê çawa disekinî, dadgeha ewlekarîya dewletê têde, li temamî dadgehan, li hemberî desteya dadweran jî hemen Ahmed Kaya bû, zexmtir, jixwe bibawertir û .serbilind

Di parastinnameya xwe de dibêje: "Hakim beg! Ezê li beramber zihnîyetek paşketî ku bi bihîstina peyva Kurd devdrêjîya dike çawa bêdeng bim? Belê min wê şevê got "ezê ji ser tepa serê wana danebezim heta ku realîta Kurdan nas nekin û niha jî wê gotinê dubare dikim. Tekoşîna min di her warîde dê bidome ta ku "realîta Kurdan tê qebûlkirin û mafê wan tê dayîn



Disan di hevpevênekêde li Firansayê Ahmed Kaya dibêje: ”Ez hunermendim. Stran dinivîsim, hozan duhûnim, şirove dikim ku milyon guhdarî dikin. Ez hunermendekî muxalif im, civakî me. Ez vê gavê li vir bim jî, hunera min ku hewla lîstikên mezin li ser tê dayîn, li her derê ye. Li her derê cîhanê hunermendê dost û hevalên min hene ku wek min dilê xwe dane hemû cure kultur û ayîn û zimanên cîhanê. Ji Vietnamê ta Efrîqya, heta digije Bosnayê.. ewên ku di her derfetêde cîyê xwe li cem gelên jêrdest girtin, ji Bob Dylan, Paul Simon, Joan Baez, Sinead O´Connor… ji wan kesayetîyên di dîroka muzîkêde cîyê xwe girtin, navê xwe nivîsandin re hezar rêz û hezar silav dişînim… Dilê min û mejyê min heta ku li kar bin dê li cem gelên bindest û bi wanre be… bedêl çi dibe bila bibe, dixwazî bila destê min ji welatê min, ji gelê min, ji kes û karê min, ji nîştîman “!biqetînin… ewê rojek were strana Kurdî azad be, bese idî heta ku, heta kîngê hûnê Kurdan tune hesabkin

## Berhemên Ahmed Kaya

Li gel çend albumên ku piştî koça wî ya dawîn derketin piyasê, zêdetir ji 20 albumên Ahmed Kaya derketin. Her yek ji albumên wî rekora firotinê şikandin, çendîn car di serê lîsta yekem de cîh girtin. Li ser hema bigrin her yek ji albumên Ahmed Kaya doz hatin vekirin. Gelek albumên wî hatin qedexekirin, berhevkirin. Li hinek deverên Turkiyê kirrîn, firotin, guhdarîkirin, li mal an li dukanê peydakirina albumên Ahmed Kaya bi biryara parêzgarê wê deverê ji kok ve hat qedexe kirin. Ahmed Kaya bi dehan xelatên muzîkî û .hunerî bi dest anî

Di nav stranên Ahmed Kaya de stran hene ku hîn jî di nava Top 10 de cîh digrin. Ahmed Kaya zêdetir ji 200 .stran û hozan nivîsî û tomar kir ku yek ji yekê zêdetir deng anî

## Merasima bixaksipardina Ahmed Kaya

Roja 18.11.2000 Enstituya Kurdî li Parisê merasima bi xak sipardina Ahmed Kaya saz kir. Gelek hunermend û nivîskar û ronakbîr û kesayetîyên siyasî û navdar yên biyanî û bi hezaran Kurd beşdarî merasimê bûn. Gulten Kaya (hevsera Ahmed) li ser qebra Ahmed Kaya vê axavtinê kir: “Mezintirîn xewn û daxwaza Ahmed ew bû ku bizvire welatê xwe. Em niha bi vê hisretê Ahmed rêwî dikin. Ahmed ji Turkiyê xeyidî bû, ji bo vê çendê li vir (FIransa/Paris) bû. Heta roja ku li radio û televizyonên Turkiyê stranên Kurdî serbest neyê gotin termê Ahmed Kaya dê neçe wî welatî. Koça dawîn ya Ahmed eybeyek bû. Heta ku Turkiye bi vê eybê “re rû bi rû nebe, ez dixwazim gora Ahmed Kaya li vir be

Nivînê Ahmed Kaya

Gora Ahmed Kaya wek cî-nivîn, wek mala wî hatiye çêkirin. Gultena hevsera wî di her wurdekarîyeke qebra Ahmed Kaya de, beşek ji jîyana wî nimandîye. Her çi tiştên ku Ahmed jê hez dikir, bi awakî têde hatîye danîn an neqişandin. Li ser mermerê qebrê ji enstrumanên ku li pey xwe hîştibû heta manqala wî ya nigşkestî ku bi dostan re goşt li ser dibirjand, hatiye neqişandin. Çengek axa Mezopotamya û baqê gulên ku jê hez dikir… .saza Ahmed Kaya li gel piyanoya wî jî li ser mermer hatine kolan û neqişandin

Teksta li ser qebra Ahmed Kaya

Li ser mermerê qebra Ahmed Kaya risteyek ji besteyeke wî ku bi salan berî koça xwe ya dawîn gotibû, hatiye :nivîsandin ku dibêje

ez di nava êşek ku pênasekirina wê ne-mumkun de me“

,Li xerîbîyê bû êvar ez dîsa li pey ba´yê me

“Ji welatê xwe dûr, di bin baranêde me, êvar hat sirgûn bêdeng dibe

Turkiyê jêr bi jêr gelek hewl da ku mexberê Ahmed Kaya biguhêze Turkiyê lê Gulten Kaya û Melîsa (keça wan) heta niha rizamendî nîşan nedane. Ahmed Kaya îro jî li gorristana Pere Lachaise ya Parîs´ê li gel .Yilmaz Guney, Dr. Abdurahman Qasimlû û Dr. Şerefkendî di nava nûrêde radizên

